# ڕێگای بەهەشت

بە هۆنراوەو پەخشان

## ئادابی بەڕێکردنی موسوڵمان بە ڕێگای بەهەشتی پیرۆزدا

دانراوی

مەلا عبدالکریمی مدرس

چاپخانەی ئیرشاد ـ بەغداد

١٤٠٦هـ ـ ١٩٨٦م

## بسم الله الرحمن الرحيم

به ناوی زاتی خوای پەروەردگار
پەروەردگاری بێ گیان و گیاندار
بەخشندەی شوعوور بە گیانداران
بۆ خۆشی ژیان لە ڕۆژگاران
تا خواستت ببێ ئەژین بە خۆشی
کە خواست نەما گیانیان ئەکێشی
یانێ بە توولی ڕووی ڕۆژگاران
گیان ئەمانەتە لەلای گیانداران
دروود بۆ گیانی پاکی پێغەمبەر
یانی ( محمد ) شەفیعی مەحشەر
هەم لەبۆ گیانی هەموو یارانی
بە گیان و بە ماڵ فیداکارانی
بو ئەهلی بەیتی ناو خانەدانی
بۆ ئالی بەرزی هۆشمەندانی
بۆ پەیڕەوانی بە یاسای ئیحسان
لە نەوعی پەری و لە نەوعی ئینسان
ئەمجا براکەم ئەم شیرین نامە
وەربگرە لە من بۆ وەفات نامە
چی تیا نووسراوە یاسای مردووە
واجیبی زیممەی شەخسی زیندووە

فەرزە لەسەری کە بەجێی بێنێ
نەوەك لای خودا سەر دانەوێنێ

## گەلێ پێویستە ئینسان هوشیار بێ لە مردن

گەلێ پێویستە ئینسان هوشیار بێ
تا بەختیار بێ ئەر خودا یار بێ
ئینسانی هوشیار بێشك ئەزانێ
ئەبێ هەر دەرچێ لە ڕووی جیهانێ
دەی وەها دەرچۆ خاوەن شەرەف بی
تاجی عیزەتی سەری سەلەف بی
کەلەدایك بووی بە بەهرەمەنی
تۆ ئەگریایتو دۆست پێ ئەکەنی
کردەوەت وابێ کاتی کە ئەمری
تۆ پێ بکەنی کە دۆستت ئەگری
دونیا مەزرەعەی کردەوەو کارە
جیهان مەنبەعی خەبری هوشیارە
ئەو کەسە بەڕێی عەقڵدا ئەڕوا
کە ئاوو خاکی بەزایە نەڕوا
هاوین تێکۆشێ تا کاتی زستان
خانووی بۆ ببێ بە باخو بێستان
ڕەنجە واسیطەی گەنجی دونیایە
گەنجیش شایستەی شەخسی وریایە

پیویستە ئینسان بۆ دین و دونیا
بە شەوو بە ڕۆژ وریا بێ وریا
ئینسان پێویستە حاڵی وەها بێ
بە یادی خوا دڵی ئاوا بێ

## زیکری خواو وەصییەت

زیکری حەق بە دڵ کاری مەردانە
ڕێکیی دەم و دڵ بەهرەی مەردانە
گەلێ بەسوودەو نافیعە لەبۆی
بیرکردنەوەی لە مردنی خۆی
هەتا ڕوو بکا بەلای خوداوە
گیرۆدە نەبێ بە لای دونیاوە
ئەو ئینسانەیە بەحەق هوشیارە
لە پاشەڕۆژی خۆی خەبەردارە
ئاگای لە خۆی بێ بۆ قەرزو قۆڵە
تا دانەمێنێ لەو چاڵە چۆڵە
واجیباتی خۆی لە نەزەرا بێ
وەسیەت نامەی لە لای سەرا بێ
هەر ئەمانەتێ وا بەلاتەوە
وەصیی بۆ بگرە زوو بیداتەوە
تا ببەنی نەخۆش لەسەر خەتەرە
ڕێبوارێکە لەسەر سەفەرە

# وەصی یەت

زۆر باشە ئینسان بە تەندروستی
کاتی هوشیاری‌و ساغی‌و سەربەستی
بەشی خۆی دانێ لە بۆ قیامەت
نەوەك کوتووبڕ بمرێ بە مەینەت
سێ یەکی مالی بکا بە ئیحسان
هەرکەس پێی ئەگا لە نەوعی ئینسان
میفدارێ دانێ لەبۆ ئەوانە
کە دێن بۆ پرسە ئەوچەند رۆژانە
ئەوەی ئەخوێنێ سوورەی ( فاتیحە )
نەك لەبۆ ژنی لەقەب ( نائیحە )
تا ئەگەر یەکێ نانێکی بخوا
حەرام نەبێ بۆی بە شەرعی خوا
لای ( ابن حجر ) ئەمە ڕەوایە
باقی فوقەهایش باوەڕیان وایە

وەسیەت کردن بە خێرات بۆئەوە کە ئینسان خێری کاتی ژیانی بگەیێنێ بە کاتی مردنی مەندووبەو کارێکی شەرعی‌و پەسەندە • لە حەدیثی صەحیحدا هەیە کە حەقی موسوڵمان ئەوەیە لە ماوەی شەوێك‌و دووشەوا ماتڵ نەبێ لە وەسیەت کردن • لەواقیعا مردن زۆر نزیکە لە ئینسانەوەو نازانێ کەی ئەمرێ • کەواتە دەربڕینی خێراتی خۆی بۆ پاش مردن زۆر ئیحسانە ، وەسیەت واجبە لەسەر یەکێ

قەرزی لەسەر بێ ، یا ماڵی ئەمانەتی خەڵکی لا بێ • هەروا واجبە یەکێ بکا بە سەر وەسیەتی خۆی بۆ دانەوەی قەرزو ، بۆ تەسلیم کردنەوەی ماڵی ئەمانەتی بە خاوەنەکەی و ، بۆ تەمێ و تەربیەی منداڵەکانی ئەگەر بۆی مومکین بێ ، بەم جۆرە ئینسانێکی صاڵح بێ لەو شوێنە • وە سوننەتە وەصیەت بکا بە خێرات هەتا سێ یەکی ماڵی ، هەروا لە (ابن حجر)دا هەیە کە ئەڵێ لە فوقەها فتوایان داوە بەوە کە دروستە وەسیەت بکا بە ئەندازەیەک لە ماڵی خۆی بۆ خواردەمەنی ئەوکەسانە کە دێن بۆ پرسە ، وە بە یاسای شەرعی پرسە ئەکەن ، نەك بۆ ئەوکەسانە کە بانگ هەڵئەدەن ، یا ئەو ژنانە کە مردوو ئەلاوێننەوە ، وەسیەت بۆ ئەوانە حەرامە • ئینسان پێویستە ئاگای لەم ئەحکامە شەرعی یانە بێ •

## یاسای ئینسانێ نەخۆش بکەوێ

کەسێ نەخوش کەوت با دڵی شاد بێ
دڵی لە حوببی دونیا ئازاد بێ
ئەمرۆ یا سبەی لا هەر لای ئەوە
هیوای بە خوا بێ پەنا هەر بەوە
با لە دەمیا بێ تۆبە لە تاوان
خێرات دابنێ لەبۆ داماوان
نەخۆش نەخۆشی تەمەنی پیری
بە غەیری مردن نییە دەسگیری
لەسەر سەعاتە مانەوەی ئینسان
پیرۆزی ئینسان هەر خێرەو ئیحسان
لە نەخۆشینا قورئان بخوێنێ
بۆ زیکری خودا زمان هەڵبێنێ

له نەخۆشینا سەد « قل هو الله »
مایەی نەجاتە بە ئیزنی الله
خۆشە خاتیمەت وەها بێتەجێ
بە ( لا اله الا الله ) ببێ

## سەردانی نەخۆش

سەردانی نەخۆش سوننەتی دینە
یاسای ڕەهبەری خاوەن تەمکینە
هەر لە ئەوەلی نەخۆشینەوە
هاتوچۆی بکەی بەتەمکینەوە
ماوەی دانیشتن سوننەتە کەم بێ
نەك دلی نەخۆش موبتەلای خەم بێ
و ناڕێ نەلێن ببێ بە موشکل
ببێ بە ئەساس بۆ تاریکی دل
پێی بلێن برا هەرچەن ناساغی
بە ڕەنگی ڕوخسار وەکو گولباغی
خودایش کەریمە بەخشندەو سەتتار
ئەبەخشێ تاوان لەسەر تاوانبار
با دلی ڕێك بێ لەگەل خودادا
نەڕوا بە بێسود لەگەل هەوادا

سوننەتە ئینسان ئەوەندەی پێی بکرێ بیر لەمردنی خۆی بکاتەوە بوئەوەی کە خۆی لە کردوەی ناڕەوا دووربخاتەوە ، پێویستە بۆ

نەخوش وەسیەت بکا بۆ ئەوکەسانە کە نزیکن لێیەوە ، وە باوەڕیان پێ ئەکا لەبارەی قەرزوقۆڵەوە کـە لەسەریەتی وە ئـەو ئەمانەتانـە کـە دراونەتە دەستی ، وە یەکێ دیاری بکا بۆ دانەوەیان ، وە ئەگەر قەرزی لەسەر خەڵك بێ باسی بکا وە سونەتە دەمی بە ناوی خـوداوە بێ • وە غافڵ نەبێ لـە ناوی خوداو لا اله الا الله زۆر بخوێنیتەوە ، وە سەدجار سوورەتی قل هو الله بخوێنێتەوە •

کەوتە حاڵی خۆی حازر بن لە لای
هەرکەسێ ڕێکەوت لە خزمو برای
یاسین بخۆینن چەند جار لەسەری
ئەمری پێغەمبەر هاتوە لەسەری
قورئان بۆ زیندوو مردو بە سوودە
کەلامی زاتی خودا مەقصوودە
وشەی شەهادەت بخەنە یادی
بەڵکو بۆی ببێ بەهۆی دڵشادی
وشەی شەهادەت بڵێن لەلایا
با ئەویش بیڵێ لەگەڵ برایا
دڵی تێك مەدەن بە ناوی گریان
با سیبەی نەبێ بە قیمەی بوریان
جا لە پاش مەرگی هەرکەسێ بگری
قەیناکا هەرچەند چاترە صەبری

عەیادەت واتە چوونەلای نەخۆش سونەتە ، بـا چاوێشەشی بێ ، وە

سوونه‌ته کەم دابنیشێ با نەخۆشەکە دڵی مەلوول نەبێ ، لە عەیادەتا فەرق نی‌یە لەبەینی ناسراوو نەناسراو و خزمو بێگانەدا ، هەتا سوونەتە عەیادەتی ئەهلی ( ذمة ) لـە جوولەکەو گاور بەمەرجێ دراوسێ بن ، یا علاقـەو پێوەندیان لە گەڵدا بێ ، بەڵێ ئەم عەیادەتـە بۆ خـزمو براو دۆسـتو ئینسانی خاوەن قیمەتی ئایینی لـە دونیا ئەڵێ خێری زیاترە ....

سوونەتە نەخۆش بڕوا بۆلای دوکتۆر . وە دەرمان وەربگرێ . بەڵکو لە گەڵێ کاتا تەداوی واجبە ، وە تەرکی ئەبێ بەهۆی تاوانباری ، وەکو ئەوە کابرای نەخۆش ببێ بەهۆی ڕزگاری کۆمەڵێ لە بەڵایەك یـا لـە نەزانین یا ئەمانەتی خەڵکی لـە لا بێت وە بەپەلە بۆی نەدرێتەوە بـە خاوەنەکانیان .

وە سوونەتە ئینسانی نەخۆش زمانی بە ناوی خوداوە بێ وە سەد جار سوورەتی قل هو الله احد بخوێنێتەوە ، وە زۆر جار لا الـه الا الله بڵێت ، وە سوونەتە گومانی بە خوای تەعالا باش بێ وە هیوای میهرەبانـی بێت ، وە کاتێ وەزعی بەباری فەوتانا گۆڕا سـوورەتی یاسـین بخوێنن بەسەریا ، چونکی حەدیثی پیرۆزی لەسەرە وە سوونەتە بۆ ئەوکەسـانە وان بەلایەوە ، خۆیان لا الـه الا الله بڵێن با ئەویش لەگەڵ ئەوانا بیڵێ ، چونکی فەرموودەی حەزرەتە (ص) هەرکەسێ ئاخر وتاری لا الـه الا الله بێ ئەوە ئەڕواتە بەهەشت . ئەمانەی باسمان کرد هەندێکن لە سوونەتی کاتی نەخۆشی ...

## یاسای پاش گیان دەرچوونی مردو

پاش مەرگ دەسبەجێ خزمو براکەی
بنێن بە یەکا دەمو چەناکەی

بنێن بەیەکا پێلووی چاوانی
هەتا نەگۆڕێ شێوەی جوانی
بە دەسرۆکەیێ سەرو چەناکەی
پێکەوە بەستن بزانە تا کەی
ئەعزای ڕاکێشن هەتاکو گەرمە
چون لەو سەردەما بەدەنی نەرمە
جا پۆشاکەکەی لابەن لەبەری
چون یەك حەوایە قەبری ئەنوەری
جلێکی سوکی بدەن بەسەرا
لە بەرزی داینێن لە ماڵ یا دەرا
ئەگەر مایەوەو نەبرا بۆ حەمام
لەبەر مانیعی لە چەرخی ئەییام
با شتێکی قورس لە کێشی ئەوا
لەسەر سکی بێت بۆ مەنعی هەوا
بەلای ڕاستەدا یا بەلای چەپ بێ
یا بە قەفادا ڕووی لە قیبلە بێ
ئیعلانی وەفات لەسەر جەوازە
موسوڵمانان دێن بۆ سەر جەنازە
دوروستە ماچی ڕوخساری مردو
بۆ بێگانەو خزم بە بێ یەك‌و دوو
پەلەپەل بکەن بۆ ئەدای قەرزی
لەبۆ تەنفیذی وەسیەتی بەرزی

ئەگەر ڕێ نەکەوت ئیزن بخوازن
لە خاوەن حوقوق ئەوسا موجازن
تا ئامادە بن بە ئەرجومەنی
بۆ غوسڵ و نوێژی بۆ کفن و دەفنی

کاتێ مردو دنیای دەرچوو زووبەزوو تا لەشی نەرمە چاوەکانی بنێن بەیەکا ، وە جمگەکانی لەشی نەرم بکرێن ، بەوجۆرە کە باسکی ببرێتەوە بۆلای ڕانی ، جا ڕاست ڕایبکێشن • وە بە دەسرۆکەیێ چەناکەی ببەسرێ بەسەریەوە ، وە بەرگەکانی هەموو لەبەر دابکەن • وە لەسەر شوێنێکی بەرز ڕای بکشێنن ، وە شتێکی قورس لەسەر سکی دابنرێ ، وە ئەوکەسەی کە ئەم ئیشانە ئەکا ، ئەبێ مەحرەمێك بێ لە مەحرەمەکانی زیاتر میهرەبان بێ ، وە پاش ئەوە دەس بکرێ بە شۆردنی مەگەر شەهیدی جەنگی کافران ، ئەوە شۆردنی دروست نی‌یە ، بە شەرع ڕەوایە کە ئینسانی خزم یا بێگانە ، ڕوخساری مردوو ماچ بکا ، وە ڕەوایە خەبەر بدرێ بە مردنی ئەو کەسە ، بۆئەوە خەلکی خۆ ئامادە بکەن بۆ نوێژ لەسەر کردن ، وە ڕەوانەکردنی بۆ سەرقەبران •

پێویستە ئەگەر مەجالیان ببێ لە پێش ڕێخستنی مردووەکەدا قەرزو حوقووقێ کە لەسەریەتی بدرێتەوەو وەسییەتەکانی جێبەجێ بکرێن ، ئەنا ئیزن بخوازن لە خاوەن حوقووق با مردووەکە تەجهیز بکرێ ئەوسا حەقی قەرزارو وەسییەت جێبەجێ بکرێن •

هەروا ئەو حوقووقانە کە بەسراون بە عەینی ماڵی کابرای مردووەوە ، وەکو حەقی زەکات ، وە کرێ خانووی دانیشتن بۆ ئەو ژنانەی کە عیددەی وەفاتیان لەسەرە و وێنەی ئەمانە فەرزە لەپێش تەجهیزی

مردوەکەدا جێبەجێ بکرێن مەگەر ترسی گۆڕانی مردوەکەمان بێ ئەوە لەم کاتەدا تەجهیز پێش ئەخرێ •

وەکو نەفەقە تەجهیزی مردوو .
بڕیار دراوە بە بێ یەکو دوو
کەوابێ فەرزە لەسەر مێردی ژن
تەجهیزی بکا چ تۆ بێ چ من
بۆ مردووی بێ کەس فەرزە بە کەماڵ
تەجهیزی لەسەر ماڵی « بیت المال »
« بیت المال » نەبوو لەسەر دەوڵەمەن
فەرزە تەجهیزی برای مؤتەمەن
یانی شۆردنو کفنو نوێژەکەی
جا دەفنی جەسەی حەسرەتڕێژەکەی
فەرزی کیفایەن ، واجبی عامن
لە واجباتی دینی ئیسلامن
ئەگەر هەریەکێ لە ئارادا بێ
فەرزی عەینە بۆی دڵی ئاگا بێ

تەجهیزی مردوو لە سەر یاسای نەفەقە ئەڕوا • ئەگەر مردوەکە گەدا بوو لەسەر ( بیت المال ) ئەگەر (بیت المال) نەبوو لەسەر دەوڵەمەندە • هەستان بەو واجباتە فەرزی کیفایەیە ، هەرکەسێ بیکا لە ( ذمە )ی هەموو کەس دەرئەچێ ، وە ئەگەر هەریەکێ لەو شوێنەدا بوو ئەوە فەرزی عەینە لەسەری •

لەسەر دەستووری ئیسلام حەرامە
غوسڵو کفنو نوێژ بۆ شەهید مامە
سوننەتی دینە دەسیان لێ نەدەن
لە بەرگی خۆدا دفنیان بکەن
مەبەس لە شەهید ئەی برای دڵدار
کوژراوی جەنگە بە دەستی کوففار
لە خەستەخانە بریندار بمرێ
غوسڵو کفنو نوێژی بۆ بکرێ
لە لای ئیمامی ئەعزەمدا وایە
کوژراوی جەنگی باغی وەهایە
هەروا کوژراوی ( قطاع الطریق )
جەردەی ڕێگەگر بزانە تاقیق
یا کوژراوی دز لە کاتی شەوا
هەموو شەهیدن لە حوکمی ئەوا
شۆردنیان نی‌یەو نوێژیان فەرزە
تەقلیدی بکەن واتەکەی بەرزە
لە لای شافیعی بە قەولی جەدید
نوێژ ڕەوا نی‌یە بۆ مردووی شەهید
ئەوەی کە ئەڵێن حەزرەت نوێژی کرد
لەسەر شوهەدای واقیعەی ( اُحُد )
ئەڵێ لەو نوێژە مەبەس دوعایە
نەک نوێژی مەشهور برای بەمایە

بەچکەی لەبارچوو پاش حەیات بمرێ
ئەبێ تەجهیزی جێ بەجێ بکرێ
شۆردن و کفن و دەفنی واجیبە
هەروەها نوێژی لە مەتالیبە
ئەگەر نیشانەی حەیاتی نەبێ
بەڵام سوورەتی ئینسانی هەبێ
نوێژی ناکرێ بەڵام ماباقی
یانی کفن و دەفن فەرزە بەتاقی
ئەگەر سوورەتی ئینسانی نەبوو
بیپێچنەوە دفنی بکەن زوو
هەر ( عضو )ێکت دی لە لەشی مردوو
نوێژو کفن و دفن واحبە هەموو
کە غوسڵی واجیب ئیمکانی نەبوو
( تیمم ) فەرزە بیکەن زووبەزوو
مەسحی ڕوخسارو دوو دەستی مردوو
لەگەڵ نییەتا بە بێ یەکودو

بزانن مردوو کە شەهید بێ شوردن و کفن و نوێژ لەسەرکردنی حەرامە ، لەسەر بیروباوەڕی ئیمامی شافیعی خوای لێ ڕازی بێ ، وە هەر لە بەرگ و پۆشاکەکەی خۆیا بە بێ دەستلێدان دەفن ئەکرێ ، وە شەهید بەوکەسە ئەڵێن کە لە جەنگی کافرانا بکوژرێ ، جا ئەگەر لە جەنگا بریندار کراو لە خەستەخانەدا مرد ئەوە وەکو مردووی عادەتی وایە شۆردن و کفن و نوێژو دەفنی واجبە ، وە ئەو قسە کە مەشهوورە گۆیا

حەزرەت نوێژی لەسەر شەهیدەکانی واقیعەی (اُحُد) کردوە ، ئــەوە مەبەس لەو نوێژکردنە دوعابۆکردنیانە ، ئــەنــا بەقــەطعی نوێژی بۆ نەکردوون ..

بەڵام لەسەر بیروڕای ئیمامی ئەعزەم (ابو حنیفه) خــوای لــێ ڕازی بێ ، ئەوە لە شەهیدانە کە ناشۆرێن و کفنیان بۆ ناکرێ و لە بەرگی خۆیا دەفن ئەکرێن بەڵام نوێژ لەسەرکردنیان واجبە وەشــەهید لــە مەزهەبی ئەم ئیمامەدا وەکو بە کوژراوی جــەنگی کافران ئەوترێ بــە کوژراوی جەنگی کۆمەڵی یاخی‌یان ( بغــاة )و چەتە ( قطــاع الطریق ) و ڕێگرو یەکێکیش ئەوترێ دز بێتە سەری و بیکوژێ . ئەمانە شەهیدن وە شۆردنیان نی‌یە ، بەڵام نوێژیان لەسەر ئەکرێ ، وە منداڵی کە لەباربچێ ئەگــەر لەپاش زینــدوێتی مردوە ئەوە وەکــو مــردووی دەرەوە وایە ، شوردن و کفن و نوێژو دەفنی واجبە ، وە ئەگەر نیشانەی حەیاتی نەبێ ، بەڵام شێوەی ئینسانی تیدابێت ئەوە نوێژی لەسەر ناکرێ بەڵام شــوردن و کەفن و دەفنی واجبە ، وە ئەگەر شێوەی ئینسانی تیا نەبوو ئەوە بیپێچنەوە لــە پارچەیێك و دەفنی بکەن ئیتر غوسڵ و نوێژی نیــە ،

ئەگەر (عضو)ێك لــە ( اعضاء )ی یەکی لە موسوڵمانانی خۆمانمان دیت ، ئەوە واجبە وەکو مردووی تەواو بشۆررێ و کفن و نوێژی بکرێ ، ئەگەر مردوو وای بەسەرا هــات کــە شۆردنی لــەتوانادا نــەبوو ئــەوا پێویستە (تیمم)ی بکرێ ، بەمجۆرە یەکێ دوو جار دەست بدا بە زەویداو نیەتی ( تیمم ) بێنی و ڕوخسارو هەردوو دەستی مردوەکە مەسح بکا .
پێویستە ئینسانی موسوڵمان ئاگای لەم یاسایانە بێ و ڕەفتاریان پێ بکا .

# شۆردنی مردوو

شۆردنی مردوو بە یاسای ئیسلام
ئادابی هەیە بیزانن بەعام
ژن ژن بشۆرێ ، پیاویش پیاو
سوننەتی دینە ئەی برای خۆشناو
پیاو بۆ ژنی خۆی یا ژنی مەحرەم
هەم عەکسی ئەمە باشە خاترجەم
شۆردنی کوڕو کچانی منداڵ
لەبۆ ژنو پیاو ڕەوایەو حەڵاڵ
ئەگەر هەر تەنیا نامەحرەم ببێ
ژن بۆ غوسڵی پیاو پیاو لەبۆ ژن بێ
لەم کاتا شۆرین تاوانەو حەرام
( تیمم ) فەرزە بە یاسای ئیسلام
ئەمە ( أصح )د بەڵام بە ( صحیح )
غوسڵی دروستەو نابێ بە قەبیح
بەم مەرجە زیندوو بۆ کابرای مردوو
( قطعا ) نەڕوانێ ئەگەر قابیل بو
کە هاتو شۆردی کافی‌یە کافی
با کافریش بێ بە واتەی سافی
لەبۆ ( تیمم ) نییەت پێویستە
بە جۆرێ بیستت کافی‌یەو بەستە

## ئەبێ بە جێگر بۆ شۆردنی ئەو
## یاسای ئیسلامە بە نورو پڕتەو

شۆردنی مردوو پیاو یا ژن گەورە یا بچووك فەرزە لەسەرمان پێویستە ژن ژن بشۆرێو پیاو پیاو ، بەڵام بۆ مردوویێ کەمناڵ بێ کوڕ بێ یا کچ دروستە پیاوو ژن بیان‌شۆرێ مادام نەگەیشتبن بە تەمەنێك ئارەزووی نەفس بۆیان بڕوا ، هەروا دروستە بۆ پیاو ژنی خۆی بشۆرێ ، وە ژن مێردی خۆی بشۆرێ ، وە پیاو دایكو خوشكو کچو پووری خۆی بشۆرێ • وە ژن باوكو کوڕو براو مامو خاڵی خۆی بشۆرێ • (الحاصل) شۆردنی مەحرەم دروستە بۆ پیاوو ژن ، ئەگەر هەر نامەحرەم هەبوو نەی‌شۆرێ بەڵکو ( تیمّم )ی مردووەکە بکەن • ئەگەر وا هەڵکەوت نامەحرەم شۆردی ، قەناعەت ئەکرێ بەو شۆردنە مادام ڕەسا بێ ، حەتتا با ئەو نامەحرەمە ئینسانێکی کافر بێ ؟ چونکی شۆردنی مردوو نیەتی نی‌یە تا بڵێین کافر خاوەنی نیەت نیە •

با بە خەڵوەت بێ شۆردنی مردوو
مەحرەم بیشۆری چاکە ئەگەر بوو
شۆردنی مردوو شۆردنێکە وا
عامو شامیل بێ بە لەشی ئەوا
شۆردنی مردوو نی‌یەتی ناوێ
بەڵام دەس‌نوێژی نی‌یەتی ئەوێ
گیانی بشۆرێ چ پێستو چ موو
کافی‌یە بە شەرع ئەرچلۆنێ بوو

بەڵام بە یاسای ئایینی ڕەسا
فەرموو وەربگرە دەرزی مامۆسا
جەنازە دانێن لە شوێنێ بەرزا
قەت ڕای مەکێشن لە تەختی عەرزا
بە ئاوێکی سارد موناسیب بۆ حاڵ
ئەعزای بشۆرن بە شێوەی کەماڵ
ئەگەر پێویستی بە ئاوی گەرمە
بە عوزری شەرعی وا تەت لەسەرمە
داینێ لەسەر قنگ چۆن ڕێکەوێ بۆی
پاڵ بدا پشتی بە کەشکەی ئەژنۆی
دەستی ڕاست لەسەر شانی بێ جلی
پەنجەی زل لەسەر قوڵی پشتملی
دەستی چەپ بێنێ لەگەڵ هێزی دەس
بەسەر سکیدا بێ ترس و مەبەس
جا ڕای بکێشێ لەسەر قەفی پشت
کیسە لەدەس کا بەرو پشتی مشت
هەرچۆن ئاسانە بۆی هەڵئەسووڕێ
عەورەت پاش و پێش پوختە بشۆرێ
جا دەس کێشەکەی تازە کاتەوە
باش دەم و لووتی پاك بکاتەوە
دەم و ددانی بە ئاوی ( نظیف )
پاك بکاتەوە لە ماددەی ( کثیف ).

بەلام با دەمی زۆر نەکاتەوە
بۆ ئیحتیرامی لابکاتەوە
مەگەر شتێکی پیسی تێدابێ
ئەوجارە ئاویش با لەگەڵیا بێ
پاش ئەمە تەواو دەسنوێژی بگرێ
ئاگای لە خۆ بێ غەفڵەت داینەگرێ
بۆ ئەم دەس نوێژە کە خۆی سوننەتە
نی‌یەت هێنانی فەرزی ( ذمة )ە
جا سەروڕیشی بشۆرێ تەواو
بە شانەشیان کا شانەی دان بڵاو
ئەمجار ڕایکێشێ لەسەر قەفی پشت
دەس کێشی تازە بگرێتەوە مشت
لای ڕاستی بشوا لەسەر هەتا پێ
ئەمجار لای چەپی با ئاگات لێ بێ
جا لەشی مردوو هەڵبسوورێنە
بۆسەر لای چەپی‌و حیکمەت بنوێنە
نەیخا بەڕوودا با هەر بەمجۆرە
لەسەر لادا بێ ئەمە زەروورە
لای ڕاستی پشتی بشۆرێ تەمام
پێش خستنی ڕاست ڕەسمە بۆ ئیسلام
جا بیخاتەوە بە سەر لای ڕاسا
لای چەپی بشوا لەگەڵ ئیخلاسا
لەم شۆڕینانا بۆن‌خۆشێ هەبێ
دەفعی بۆنی پیس لەو شەخسە ئەبێ

ئەم شۆردنانە کە بەیانم کرد
هەمووی یەك غوسلە بۆی بڕوانە ورد
غوسلی دووهەمیش بە وێنەی یەکەم
لە گەل بۆنخۆشیێ ببە خاترجەم
بەڵام سێهەمین ئاوێکی ساف بێ
بۆنخۆشی نابێ نەك جێی خیلاف بێ
چونکە ئەو ئاوە کەپێیێ ئەشۆرێ
ڕەنگ‌و بۆن‌و تام نابێ بگۆرێ
یەکێ لەو سێ‌یە بگۆڕێ ئەلحەق
شرعا دەرئەچێ لە ئاوی موتلەق
لەدوای شۆردنی مردووی موحتەرەم
پیسی پەیدابوو زیادە یا کەم
تەنیا شۆردنی ئەو شوێنە فەرزە
نەك ئیعادەی غوسل ئەم دەرزە بەرزە
بە لەیەکدانی پێستی نێرو مێ
تێك ناچێ غوسلی با ئاگات لێ بێ

لای کەمی شۆردنی مردوو ئەوەیە کە لەپاش لابردنی هەر پیسی‌یەك کە بەلەشیەوە بێ هەموو گیانی بە ئاوێکی پاك‌و پاکەوەکەر بشۆرن وە ئەو ئاوە بگا بە هەموو شوێنێکی کە شۆردنی پێویست بێ بۆ لابردنی لەش‌پیسی تەنانەت ژێری پێستی سەری زەکەری نێرینەیەك خەتەنە نەکرابێ •

ئەگەر مردوەکە قابیلی شۆردن نەبوو پێویستە ( تیمم ) بکـــرێ هەروەها ئەگەر شوێنێکی قابیلی شۆردن نەبێ ئەوە ( تیمم )ی ئەکرێ

لەپاش شۆردنی ئەو شوینە • بزانن واجب نی یە لەسەر مردوشور نی یەتی غوسلی مردوو بهێنێ بەلام سوننەتە نی یەتی غوسلەکەی بهێنێ ، هەروا بۆ ( تیمم )ەکەیش نی یەت هێنان سوننەتە و واجب نی یە ئەوەندە هەیە واجبە ( تیمم )ی مردوو لەپاش لابردنی هەموو پیسی یەك کە بە لەشی مردوەکەوە بێ •

ئەگەر لەپاش شۆردن یا پاش ( تیمم ) شتێکی پیس لە لەشیەوە هاتەدەرەوە تەنها واجبە ئەو پیسی یە لابیرێ و دووبارە کردنەوەی شۆردن و (تیمم) کردی واجب نی یە • حەرامە لەسەر مردووشۆر تەماشای عەورەتی مردووەکە بکا • کەراهەتیشی هەیە تەماشای غەیری عەورەتی بکا مەگەر ئەوەندە کە پێویست بێ بۆ شۆردنەکەی • لای ژورووی شۆردنی مردوو ئەوەیە لە شوێنێکی خەلوەتا بێت و شوێنەکە سەر داپۆشراو بێ ، وە لەسەر تەختەیەك دابنێن و دیزداشەیەکی لەبەرابێ لەشی داپۆشێ • بەئاوێکی ساردیش بشۆرێ ، مەگەر لەبەر عوزرێ پێویست بێ بە ئاوی گەرم بشورێ • ئەبێ وەزعی شۆردنەکەیشی وابێ مردووەکە لەسەر ئەو تەختە دابنیشێنرێ بەجۆرێ مەیل بکا بۆلای پشتەوەو مردوو شۆرەکە دەستی ڕاستی لەسەر شانی ڕاستی مردووەکە دابنێ و پەنجەی گەورەی دەستی لە قوولایی بشتی ملی توند بکاو پشتی بدا بە ئەژنۆی ڕاستی خۆیەوە ، جا دەستی چەپی بەهێز بهێنێ بەسەر سکیا بۆئەوەی ئەگەر شتێکی تیابێ دەربچی • ئەمجا بەسەر پشتا ڕای بکێشێ و بە دەستی چەپی بە لەفافەیەکەوە عەورەتی بەرو دوای بشۆرێ ، پاش ئەمە لەفافەیەکی تر بکاتە دەستی ، پەنجە بکا بە دەمیا وە بیهێنێ بەسەر دانەکانیا • وە هەرچی لە کونەلووتەکانیا هەبوو پاکی بکاتەوە • جاوەك دەس نوێژی زیندوو دەس نوێژێکی باشی بۆ بگرێ • واجبە لەسەر مردوشۆرەکە نی یەت بۆ ئەم دەس نوێژە بهێنێ بەلام نی یەتی دەس نوێژی سوننەت بهێنێ ، پاش ئەمە

سەرو ڕیشی بشۆرێ بە ئاوێـکی‌وا بە شـتێکی بۆن‌خۆشـی وەکو مۆرد بون‌خوش کرابێ ، وە بە شانەیەکی دان‌شاش بە نەرمی‌و ئارامی بۆی دابهێنێ • وە ئەلەر موویەکی لێ کەوتە خوارەوە بیخاتەوە ناو موەلانی ، پاش ەمە لای ڕاستی بشۆرێ لە سـەر تـا پێ جـا لای چەپی ئەوجـار هەلیسوڕێنێ بۆ لای چەپی بۆ ئەوە کە لای ڕاستی لەپشتەوە تا پێ بشۆرێ•

جا هەلیسووڕێنێتەوە بۆ لای ڕاستی : بۆئەوە کە لای چەپی بشۆرێ لـە سەرووی پشتیەوە تـا پێی •

وە لە هەمو ئەم شۆردنەشدا شتێکی بۆن‌خۆشی وەکو مۆرد تێکەلی ئاوەکە بکات • ەمە هەمووی کـە وتمان ، بە ناقـە غوسلێ دائەنرێ • سوننەتە بۆ جاری دووهەمیش وەك جاری یەکەم بیشواتەوە • هـەروا جاری سێهەمیش ، بەلام بۆ جاری سێهەم بە ئاوێکی ڕووت لە بۆن‌خوشی هەموو لەشی وەکو جارەکانی‌تر بشوا • ئەمە سێ جار ، ئەم سێ جـارە هـەر جاری سێهەمی بەکاردێت ؛ چونکە جارە پێشووەکان ئاوەکە بەهۆی ئەوشتە بۆن‌خۆشانەوە کە تیایا بوون پاکەوەکەر نەبوە ، بەلام ئاوی جاری سێهەم ئاوێکی ساف بووە شتێکی تیا نی‌یە بۆنی بگوڕێ ، ڕادەی زۆر تەواوی شۆردنی مردوو ئەوەیە • هەر کـام لەم سـێ شـۆردنـە دوو جاری تریش دووبارە بکرێتەوە کە هەمووی ئەکاتە نۆ غوسل ••

باشتر ئەوەیە پیاو پیاو بشۆرێ‌و ژن ژن ، بەلام دروستیشـە پیاو ژنی خۆی بشۆرێ‌و ژن مێردی خۆی بشۆرێ ، ئەوەندە لەم کاتەدا سـوننەتە مردووشۆرەکە دەس پێچکێکی بەدەستەوە بێ ، بۆئەوەی دەستی نەکەوێ لە پێستی مردووەکە هەرچەندە مەحرەمیشە •

تـەرتیب لە شـۆردنی مردوودا ئەوەیـە یەکـەم ئـەو پیاوانە کـە موستەحەقن بۆ نوێژ لەسەرکردنی وەکو باوك‌و باپیرەو کوڕو کوڕەزا

جـا برای باوكو دایكی ، جا برای باوكی ، دووهەم پیاوێ كە مەحرەمی بێ وەكو خاڵو باوەپیارە ، سێهەم پیاوێ كە خزمایەتی لە گەڵیا هەبێ وەكو خاڵۆزا • چوارەم پیاوی بێگانە ، پێنجەم ژنی خۆی • لە شۆردنی ژنیشدا تەرتیب بـەم جۆرەیە :

یەكەم ژنێ كە مەحرەمی بێ ، بەڵام پووری خوشكی باوك لەپێش پووری خوشكی دایكەوەیە • دووهەمژنێ كە خزمی بێت وەكو پوورزاو خاڵۆزا ، سێهەم مەحرەمی شیر وەكو خوشكو خوشـكەزای شـیری •

چوارەم مەحرەمی ژنو ژنخوازی ، وەكو خەسوو بووكو كچی مێرد ••• پێنجەم ژنی بێگانە • شەشەم مێردی ئەو ژنە كە مردوە • ئەگەر مردووەكە ژنی زەیسان یا خاوەنحەیز بوو ، ئەوە تەنیا ئەم غوسلی مردنە كافی‌یەو غوسلی پاكەوەبوونی لە حەیزو زەیسانی ناوێ پاك بووبێتەوە یـا پاك نەبووبێتەوە •

ئەگەر بۆ شۆردنی ژن هەر پیاوێكی نامەحرەم هەبوو یا بۆ شۆردنی پیاو هەر ژنێكی نامەحرەم هەبوو ، ئەوە دروست نی‌یە مردوەكە بشۆرری، بەڵكو ئەبێ ( تیمم )ی بۆ بكرێ ، بەڵام ئەگەر وا هـەڵكەوت ئەو پیـاوە نامەحرەمـە یا ئـەو ژنە نامەحرەمە مردووەكەی شۆرد ئەوە كافی‌یـەو فەرزەكەمان لەسـەر لائەچێ • ئەگەر ژنی مردووشۆر لەحـەیزا بوو قەیناكە••منداڵێكیش نەگەیشتبێتە قۆناغی ئارەزوو كوڕ بێ یا كچ،دروستە بۆ پیاو یا بۆ ژن بیشۆرن، بەڵام ئەگەر گەیشتبوونە ئەو قوناخە ، ئەوە حوكمی پیاوو ژنیان هەیە • منداڵی لەبارچوو ئەگەر سەرو سوورەتی بنیادەمی یـا دەرنەكەوتبوو شۆردنو نوێژی ناوێ ، بەڵام سـونەتە جلێكی بێـوە بپێچرێو دەفن بكرێ •

ئەگەر سەرو سوورەتی بنیادەمیشی پەیداكردبوو ، بەڵام نیشانەی

زیانی نەبوو وەکو دەنگ‌و ئاوازە یا جوولەجوول ئەوە پێویستە بشوررێ‌و کفن‌و نوێژ لەسەرکردن‌و دەفن کردنی واجبە » .

ئەگەر پارچەی ئینسانێك لـە شوێنێکدا کەوتبوو ئەوە حوکمی وەکو مردوویەکی تەواو وایە شۆردن‌و کفن‌و نوێژ لەسەرکردن‌و دفن کردنی پێویستە .

شەخسی مردووشۆر با زۆر ئەمین بێ
جێگەی باوەڕو خاوەنی دین بێ
وەزعێکی باشی لە مردوو بینی
بیگیرێتەوە زۆر بە ئەمینی
عەیبێکی لێ دی سری داپۆشێ
مەگەر فاسق بێ‌و بۆ شەڕ تێکۆشێ
ئەوە باس بکا بۆ موسولمانان
ئەر نەبێ بە هۆی فیتنەی نێوانیان
نینۆك کردن‌و سەرو بەر تاشین
مەکرووهە لەبۆ مردوو بەپێی دین
بەڵکو خەتەنەیش ئەگەر نەکرابێ
وازی لێ بێنن قەی‌نا با وا بی
ئەوەی ئاسانە فەرزە بیشۆرێ
کە قابیل نەبوو ( تیمم ) بکرێ
یانی ڕوخسارو دوو دەستی مردوو
بە تۆزێکی پاك مەسحی بکەن زوو
مردووشۆر لەپاش شۆردنی مردوو
سوننەتە بۆ خۆی غوسل بکا زوو

سوننەتە ئەوکەسە مردوو ئەشۆرێ ئینسانێکی پاکو ئەمین بێ جـا ئەگەر شتێکی باشی لەو مردووەوە بینی بەساغی بیگێڕێتەوە ، خۆ ئەگەر عەیبێکی چاوپێکەوت باسی نەکاو بیپۆشێ مەگەر مردووەکە ئینسـانێکی فاسقی ئاشکرا بێ ، ئەوە دوروستە عەیبەکەی باس بکرێ بەومەرجە نەبێ بە هۆی فیتنەو غەوغا لەلایەنی کەس‌وکاری مردووەکەوە •

بزانن کەراهەتی هەیە نینۆك کردنی دەست‌وپێی مردوو ، وە تاشینی ووی سەرو ڕیشی ، هەروا مووی بەرو بن‌باڵی لانابرێن ، حەتتا ئەگەر ڕشك‌و چنكە دابوویانە مووی سەرو بەرو ڕیشی پیـاو ، یا قژی ژن‌و مەمی تـەڕبوونی مووەکانیـان ئەکرد ئـەوە عـەفـویان لـێ ئـەدرێ‌و ناتاشرێن‌و پێویستیان بە ( تیمم ) نی‌یە ••• بەڵێ ئەگەر مووی سـەرو ڕیش لەخۆیەوە لوولی خواردبو ، یا بەهۆی دەرمانێکەوە وەکوو (جەوی) نووسابون بەیەکەوەو ئاویان پێ نـەئەگەیشت ، ئـەوە لەم کاتـەدا واجبـە بتاشرێن ، •• بەڵام لـە حاشیەی ( شیروانی )دا نووسراوە دروست نی‌یە بە هیچ حاڵێ مووی مردوو بتاشرێ‌و عەفو ئەدرێ لە تەڕنەبوونی ، ئـەم فەرموودەیە جێگەی ئیعتیبارو پشت‌پێ‌بەستنە ، ڕەفتاری پێ‌بکەن ، بزانن یەکێ بە جل‌وبەرگی ئیحرامی حەج یا عومرەوە بمرێ ئەوە حەرامە وەزعی بگۆڕێ ، واتە نابێ لەکاتی شۆردنیا ئاوەکە بۆن‌خۆش بکرێ ، هەروا حەرامە کەبۆنی خۆش بکرێ بە کفنەکەیا، تا شێوەی ئەو ئیحرامەی پێوە بمێنێ • هەروا نابێ کفنی درووەمان کراوی پێوە بپێچرێ • پێویستە دەست‌و دەم‌و چاوی ژن بەدەرەوە بێ ، جا لەپاش ئەوە کە شـۆردنی مردوو تەواو بوو سوننەتە کە مردووشۆرەکە خۆی بشوا بە نی‌یەتی مردوو شۆردن •

# کفن بۆ مردوو پێویستە

کفن پێویستە بۆ لەشی مردوو
بەبانی ئەکەم حالی ببە زوو
لەشی داپۆشێ لە سەرۆ تا پێ
لەسەر میرانە واجبە بکرێ
دووهەمو سێهەم حەقە بۆ مردوو
نابێ بە مانیع ( وارث ) هەرکەس بو
بەڵام ئەگەر قەرز ماڵی دابگرێ
خاوەنقەرز مەنعی ئەوەی پێ ئەکرێ
زیاد لە سێ کفن حەرامەو بەتاڵ
ئەگەر میرات بەر مەحجوورەو مناڵ
کە سێ کفن بن با لەفافە بن
سپیو سەرتاپاو بە ( نظافە ) بن
ئەگەر تەفاوت لەوانا هەبێ
با گەورەتریان بەدەرەوە بێ
دووهەم لەو کەمتر سێهەم لەو کەمتر
تا دەرکەتوویان دەرچێ جوانتر
زیندوو کاتێ بەرگ ئەکاتە بەری
جوانتر دەرئەخا لە بۆ هاوسەرێ
هەموویشیان فەرزە کە لەش دابگرن
لەم بەرەوبەری قەدی تێپەڕن

یانێ لەپێشا گەورەتر ڕاخەن
باقی بەتەرتیب لەسەر ئەو داخەن
بۆنیان خۆش بکەن ئەو لەفافانە
با بۆنی خۆش بێ ئەو شەخسە جوانە
کفن بوون بە پێنج وا موعتەبەرە
نێر سێ لەفافەو کراسو مێزەرە
کراسی قۆڵدار داگرێ بەدەن
با سەرتاپێ بێ مەنعی لێ مەکەن
بۆ ژن لەفافە لەگەڵ ئەو سێیە
دابی شەریعەت زۆر بەڕێوجێیە
بەڵام لەبۆ پیاو چاتر وەهایە
هەر سێ لەفافەی بەقەد کیفایە
وردە کفنەکان لە ژێرەوە بن
ئەوسا لەفافە لە لەشیان پێچن
دوو ڕانی مردوو پێکەوە بەستن
لەناو فەدیشیا پشتێن ببەستن
کە داتان هێڵان بۆ قەبری خۆیان
بیانکەنەوەو لاچن لەقەدیان
کفنی مابەینی ناوکو ئەژنۆ
ناوی ( ازار )ەو دەرپێ لەلای تۆ
کراسی هەردوو لەشانەوە دێ
هەتا ئەگاتە سەر قولاپەی پێ

مێزەر لەبۆ نێر ئەیپێچن لە سەر
سەرپۆشی ژنان لەبۆ دەوری سەر
کونی لەشی گشت بە لۆکە بگرن
بەمجۆرە ڕێگەی جانەوەر بگرن
بەڵام گەر مردوو لەناو ئیحرامە
بۆنخۆشیو سەتری سەری حەرامە
ژن دامەپۆشن دەمو چاوی لەو
دووریں ڕەوایە لەبۆ کفنی ئەو
هەرچی حەڵاڵ بێ لەبۆ پیاوو ژن
لە پاش مردنیان ئەکرێ بە کفن
کفنێ شۆراو بێ ( شرعا ) ئەولایە
نەشۆراوبش بێ هەزوا ڕەوایە

مردوو کفن ئەکرێ بە هەر بەرگێ لـە کاتی زیندوێتیدا دروست بووبێ بۆی ، بەڵام باشتر ئەوەیە کە ڕەنگی سپی بێ • لای کـەمی کفن پۆشاکێکە هەموو لەشی داپۆشێ ، بێجگە لە سەری پیاوێ وە ڕووی ژنێ کە لەئیحراما بووبن لـەکاتی مردنا ، ••• ئـەم ئەندازە حەقی خودایـە هەرچۆن بووە ئەبێ جێبەجێ بێ •

ئەوەیش کە حەقی مردوو خۆیەتی سێ کفنی سەرتاپێیە • کـەس ناتوانێ مەنعی ئەم سێ کفنە بکا لە مردوو مەگەر خاوەن قەرزێکی وەها کە قەرزەکەی هەموو ماڵی مردووەکە دابگرێ • میراتگران ناتوانـــن مەنعی کفنی دووهەمو سێهەم بکەن لـە مردوو ، هەرچەند منداڵی نابانغیشیان

تیابێ ؛ چونکە ئەم سێ کفنە حەقی مردووەکەیە ، بەڵام ئەگەر خوی وەسیەتی کردبوو بۆی نەکەن ئەوە بۆی ناکرێو قەناعەت ئەکرێ بەتاقە کفنێ • ئەوەیش کە حەقی میراتکرە ، عیارەتە لە کفنی چوارەمو پێنجەم ، کەواتە ئەگەر لەناو میراتگرەکانا ماڵی نابالغ هەبوو ، ئەوە بە قەتعی ئەو دوو کفنە زیادە ( چوارەمو پێنجەم ) دروست نی‌یە لە میراتی مردووەکە بکرێن • هەروەها ئەگەر میراتکری بالغ ئارەزووی نەبوو ئەو دوو کفنە زیادە بکا ئەوا پێی ناکرێو ئەتوانێ مەنعی بکاو ئەوانەی بۆ ناکرێ • جا ئەگەر ، هیچ مانیعی نەبوو لە زیادکردنی ئەم دوو کفنەیش ، ئەوە بۆ ژن وا باشە پێنج کفنەکەی دوانیان باڵاپێچ ( لفافە )بن‌و سیانەکەیان جلێك بێ بۆ بەینی ناوکو ئەژنۆ کە پێی ئەڵێن ( ازار ) لەگەڵ کراسێکی قۆڵدار کە لە ناوشانیەوە تاقولاپەی پێکانی بگرێتەوە کە پێی ئڵێن ( قمیص ) • سەرپۆ شێکیش کە بەدەوری سەریا بپێچرێ کە پێی ئەڵێن ( قمیص ) • سەرپۆشێکیش کە بەدەوری سەریا بپێچێ کە کفن هەرسێ کفن باشترە ؛ چونکە داپۆشینی ژن لە داپۆشینی پیاو مەتڵەبترە ، بەڵام دروستە دوانە زیادەکەشی بۆ بکرێ • زیادەڕەوی لە کفن‌کردنا کەراهەتی هەیە هەرچەند مانیعیش نەبێ ، کفنی شۆراویش لە نەشۆراو چاکترە •

منداڵیش وەکو بالغ وایە لە ئادابی کفن‌دا ، ئەگەر پێنج کفنی بۆ بکەن ئەوە دروستە • ئەگەر کەسوکاری پیاوی مردوو ئارەزوویان وابو ، پێنج کفنی بۆ بکەن ئەوە واباشە سیانیان باڵاپێچو دوانیان کراس‌و مێزەر بن ، ئەگەر هەر سێ کفن کرا بۆ مردوو ، ئەوە واجبە سێ باڵاپێچی وا بن هەموو لەشی مردووەکە داپۆشن ، باشتریش ئەوەیە هەرسیانیان وەکو یەك وابن • ئەگەر گەورەو بچوکیان بوو ، کامیان گەورەترە ئەوەیان لە ژێرەوە ڕاخەن ، ئەمجا دووهەمەکەیان‌و پاشان سێهەمەکەیان • سوننەتە

دەرمانی بۆنخۆش بە هەر سێ کەیانەوە بکەن ، ئەگەر زیاتریش بوون هەر بەم پێیە ڕایان خەنو ووردە کفنەکان ، وەکو مێزەر وە سەرپۆشو کراس لەژێری لەفافەکانــەوە بن ، یا لەفافــەکان بێن بەســـــەریانا •
وە مردووەکە وشك بکەنەوەو لەسەر پشت ڕایکێشن بەســەر کفنەکاناو لۆکەی پاکی شیکراوە ، لەسەر هەموو کونەکانی لەشی دانێن وەکــو وێچکەو دەمو لووت ، جا یەکەیەکە کفنەکانی پێوە بپێچنو ، بە شتێك وەکو قایشی پشتێن لەماددەی کفنەکە قایمیان بکەن • کاتێ خســـنیانە قەبرەکەوە ئەو پشتێنانەی لێ بکەنەوە ••• بزانن کفنی مردوو لە مالــی مردووەکە ئەبێ • ئەگەر خۆی مالی نەبوو لەسەر ئەوکەسەیە کە نەفەقەی لەسەریەتی وەکو باوکو باپیرو کوڕو کورەزاو مێرد • ئەگــەر ئەمــانە نەبوون ، لەسەر مالێکە وەقف کرابێ بۆ کفن کردنی مردوو • ئەگەر مالــی وەقفیوایش نەبو لەسەر هەر موسولمانێکی دەسەلاتدارە کە لەو شــوێنەدا بێ • هەلگرتنی کفن کەراهەتی هەیە ، مەگەر کفنێك کە زۆر لە شوبهە دوور بێ بەلام هەلکەندنی قەبر لەپێش مردنا دروستە ، نەخوازەلا لــــە شوێنێکا کە عەرزەکەی ڕەق بێو بەزەحمەت هەلبکەنرێ • ئەمە کەمێك بوو لــە ئوسوولی کفن کردنی مردوو واجبە بیزانن •

## نوێژی مردوو

پاش ئەوە مردووت شۆردو کفنت کرد
فەرزە نوێژەکەی زۆر بەدەستوبرد
مەکرووهە نوێژی لەپێش تەکفینی
ئەگەر جل هەبێ بۆ داپۆشینی
ئەینا حەرامە چون سەتری عەورەت
لە کاتی نوێژا مەرجە بۆ صیححەت

فەرزە ئەم نوێژە لەسەری بکرێ
لەپێش ئەوەدا کە دفن بکرێ
کەوتە پاش دەفنیش دروستە لەوێ
بەمەرجێ کە پێش فەبری نەکەوێ
حازری ولات فەرزە بۆ ( ذمّە )ی
بێت نوێژی بکا لەسەر قەبرەکەی
مەگەر هاتنی گەلێ زەحمەت بێ
زەحمەتێکی وا غەیری عادەت بێ
ئەوە دووربەدوور نوێژی ڕەوایە
( حاشیەی جەمەل ) ئەڵێ وەهایە
ئەم نوێژە فەرزە فەرزی کیفایە
یەکێ لە گەلێ بیکا ڕەوایە
هاتو لەو شوێنا تاقە یەکێ بوو
فەرزی عەینە بۆی بڕوا بیکا زوو
حەقی وەلیە نوێژی جەنازە
باوکو باپیرەی بە ئیمتیازە
ئەمجار ( عصبە )ی نەسەبی مردوو
بە باسای میرات بە بێ یەکو دوو
بە ئیذنی ئەوان دروستە بۆ غەیر
با بیکاو بگات بە ئیحسانو خەیر
تەکراری نوێژی جەنازە ئەبێ
لە چەند کەسەوە باش ئاگات لێ بێ

نەك كردنەوە بۆ یەكێ چەند جار
ئەم شێوە دوورە لە شەرعی موختار
نوێژ لەسەر غائیب لە هەر ، ولاتا
ڕەوایە بۆ تۆ لەسەر بساتا
حەزرەت لە ( طیبە )(١) لەسەر نەجاشی
نوێژی غائیبی بۆ كرد بە خۆشی
نێرینەی منال لە بۆی ڕەوایە
ئەم نوێژە بكا بە فەدرو پایە
بەڵام قەت بە ژن جێ‌بەجێ نابێ
ئەگەر ئەو شوێنە نێر نیەی تیابێ
لەسەر چەند مردووی حازری یەك‌جێ
بە تاقە نوێژێ ( أكتفاء ) ئەكرێ
ئەگەر خاوەنیان بەوە ڕازی بن
ئەینا یەك‌بەیەك با جێ‌بەجێ بن

## شەرتی نوێژی جەنازە

شەرتی ئەم نوێژە وەكوو نوێژەكان
پاكی‌یە لەبۆ پۆشاك‌و مەكان
مردووی دابەسراو بە شریتی پیس
نوێژی بەتاڵە بێ‌شوبهەو تەلبیس

(١) طەیبە ناز ناوی مەدینەی ( منورە )یە •

فەرزە ئەو پەتەی لێ بکاتەوە
جا نوێژی بکا بە نیشاطەوە
واجبە پاکی تابووتو جێگەی
پاکی ئەو جلەش بەسەریا ئەدەی
ئەم مەسئەلەیە بەیان کراوە
لەشوێنی خۆیا تەفصیل دراوە

## ئەرکانی نوێژی جەنازە

ئەرکانی حەوتن یەکەمیان نی‌یەت
نی‌یەتی نوێژی فەرزی کیفایەت
لە سەر ئەو شەخصە کەوا مردووە
ڕووی لە بارەگای خودا کردووە
دووهەم چوار ( تکبیر ) بە حالی قیام
( اللّٰه أکبر ) فەرزە لە ئیسلام
سێهەم فاتیحە پاش یەکەم ( تکبیر )
لەگەل ( تعوّذ ) سوننەتی بەشیر
بەلام ( افتتاح ) یا ( ضمّ السورە )
سوننەت نین لێرا لێمان ببوورە
چوارەم صەلاوات پاش دووەم ( تکبیر )
لەسەر حەزرەتی ڕەسوولی بەشیر
پێنجەم . دوعایە لەدوای سێهەم
دوعا مەقبوولە لای خودای ئەکرەم

بۆ گەورەو بچووك لەبۆ ژنو پیاو
فەرقیش بە ضەمیر بۆ تو دیتە ناو
شەشەم سەلام دان لەدوای چوارەم
حەوتەم ڕاوەستان لە نوێژا سەرجەم
بەرزبکەرەوە دەستت بۆ سەرشان
کاتی ( تلفظ ) بە تەکبیرەکان
خوێندنی سیرڕی حەقە لە شەرعا
لەبۆ فاتیحەو سەلاوات و دوعا
( قیام ) زەحمەت بوو با دابنیشێ
لەتاقەت بەدەر زەحمەت نەکێشێ
نوێژی جەنازە لەگەڵ جەماعەت
بە سێ صەف ئەبێ بە مایەی زەحمەت
کاتێ ( مسبوق ) هات بەونیازەوە
نی یەت و تەکبیر بە ئیعزازەوە
ئەمجا فاتیحە بخوێنێ تەمام
جا بڕواتە سەر ئەرکانی ئیمام
بەر لە ( اکمال )ی فاتیحە ئەگەر
ئیمام گەیشتە ( الله اکبر )
فەرزە بۆ ( مسبوق ) بە شەرعی ئیسلام
تەبەعیەتی ئادابی ئیمام
جا کاتێ ئیمام سەلامی داوە
جێبەجێ بکا ئەوەی کە ماوە

لەسەر میثالی مەسبووفی صەلات
خودا بە کەرەم تەوفیقت بدات
بزانن فەرزی نوێژی مردووان
ئادابی هەیە کاتی ڕاوەستان
بۆ مردووی پیاو موقابیل بە سەر
نی یەت بهێنێ ( اللّه اکبر )
بۆ ژن لەحاستی سێ بەندەیا بێ
لەسەر ئەم یاسا ئیمام ئاگا بێ
کاتێ جەنازە برا بۆ قەبران
سەری پێشی بخەن ئەی برادەران
کاتێ دانرا لە گۆڕستانا
سەری لە لای پێی چاڵی قەبرانا
بە سێ کەس تابووت هەڵبگرن وەها
یەکێ لەپێشۆ دوو کەس لەدوا
تەشییعی مردوو ڕەوانە کردن
سوننەتی دینەو جەزا وەرگرتن
لەپێشەوە بێو بڕوا بە پیادە
ئیحسانی زۆرە لەبۆ جیهادە

ئەرکانی نوێژی مردوو حەوتن ، یەکەم : نی یەتی فەرزی نوێژی مردووەکەیە لەگەڵ ( اللّه اکبر ) کردنی ( تحرم )دا ئیتر پێویست ناکا باسی ئەوە بکا کە ئەو نوێژە فەرزی کیفایەیە یا فەرزی عەینە هەروا پێویست نی یە مردووەکە بناسێ ، ئەگەر زۆریش بوون پێویست نی یە ژماردیان

بزانێ یان بزانێ ئەو مردووە ژنە یا پیاوە ، بەڵکو ئەگەر نیـیەتی نوێژی جەنازە بێنێ بۆ هەموو ئەوکەسانە کە لـەوڕۆژەدا مردوون دروستە ، وە ئەگەر چەند مردوو حازرکرابوون ئەتوانێ بەجـارێ نیـیەتی نوێـژی هەموویان بێنێ‌و بەو تەنیا نوێژە واجبـەکە ـەواو ئـەبێ • بەوشـەرتە خاوەنەکانیان ڕازی‌بن وە بۆ مەئمووم دروستـە نیـیـەتی نوێژی ئـەو جەنازانە بێنێ کە ئیمام نوێژیان لەسەر ئەکا ، یانێ ئەگەر بەم شێوە نیـیەت بێنێ دروستە • بەڵێ ئەگەر هاتو مردووەکەی دیاری کردو ، دەرکەوت ئەوکەسە نەبووە ، ئەوە ئەو نوێژە بەتاڵە •

ڕوکنی دووهەم : چـوار ( الله اکبـر )ە ، یەکەمیـان تەکبیری ( تحرّم )ە ، یانێ دابەستنی نوێژەکە ، ئەگەر پێنج جار ( الله اکبر )ی کردو لای‌وابو دروستە ئەوە زیانـی نی‌یە بـەڵام ئەگەر بـاوەڕی وابو نوێژەکەی بەتاڵ ئەکاتەوە ، ئەوە ئەو نوێژەی بەتاڵە ، جا ئەگەر ئیمام پێنج ( الله اکبر )ی کرد بـا مەئمووم شـوێنی نەکەوێ بەڵکو بـە دڵ نیـیەتی جیایی لە ئیمام بێنێ سەلام بداتەوە ، یا ڕاوەسـتێ‌و چاوەڕوان بـکا تـا ئیمام سەلام ئـەداتـەوە •

ڕوکنی سیهەم : خوێندنی سوورەتی فاتیحەیە لە پاش ( الله اکبر )ی یەکـەم • ســـوننەتە لـە پێش فاتیحـەدا ( تعـوێذ ) بخوێنێ ، بـەڵام دوعای افتتـاح‌و خوینـدنی ســـوورەت لەپاش فاتیحە سـوننەت نین •

ڕوکنی چوارەم : صەڵاوات‌دانە لەسەر حەزرەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسـلم لەپاش ( الله اکبر )ی دووهەم ، وە صەڵاوات لەسەر ئال سوننەتە • کەوابێ بڵێت اَللهُمَّ صَلِّ علی سَیِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلی آل سیِّدنا مُحَمَّد •

ڕوکنی پێنجەم دوعاکردنە بۆ مردووەکە لـەپاش ( الله اکبر ) ی سێهەم • لای کەمی ئەم دوعایە ئەوەیە بڵێت : اللّهمَّ ارحمْه یا : اَللّهمَّ

اغْفِرْ لَهُ • دوعای مەشهووریش ئەمەیە بڵێت : اللّهُمَّ اغفِر لِحَیِّنا ومیِّتِنا وَشاهِدِنا وغائِبِنا وذَکَرِنا وأنْثانا • اللّهُمَّ مَن أحْیَیْتَهُ مِنّا فأحْیِهِ عَلَی الاِسْلام ، وَمَن توَفَّیْتَه مِنّا فتَوفَّهُ عَلَی الایمانِ ) •

وە بۆ نوێژ لەسەر منداڵی مردوو ئەمەیش بڵێ :

اَللّهُمَّ اجْعَلْهُ فَرَطاً لأبَوَیْهِ وسَلَفاً و ذخراً وعِظَةً واعتِباراً وشفیعاً وثَقِّل به مَوازِینَهُما وأفرِغِ الصَّبْرَ عَلی قلوبهما •

لەپاش تەکبیری چوارەمو پێش سەلام دانەوەیش سونەتە بڵێت :

اَللَّهمَّ لا تَحرِمنا أجْرَه ولا تَفتِنّا بعده • لە هەموو دوعاکانی ئەو نوێژی مردوودا ئەبێ ضەمیرەکان بەپێی مردوەکان بگۆڕێت • یەعنی ئەگەر مردوو نێر بێ یا مێ یەکێ بێ یا زیاتر ، ضەمیرەکەبەوپێیە بگۆڕێ •

ئەگەر کەسێ ئیقتیدای کرد بە ئیمامو بە بێ‌عوزر ڕاوەستا تا ئیمام فاتیحەی خوێندو ( الله اکبر )ی دووهەمی کرد ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە •

ئینسانی مەسبووقیش حەقی وایە کە چووە ناو نوێژەکەوەو ( الله اکبر )ی کرد دەس بکا بە خوێندنی فاتیحە با ئیمام لە شوێنێکی تریشبیا بێ ، جا ئەگەر ئیمام ( الله اکبر ) یکی‌تری کرد لەپێش ئەوەدا کە ئەم دەس‌بکا بە فاتیحە ، ئەوە لەگەڵ ئیماما ( الله اکبر ) بکاو فاتیحەی لەسەر لائەچێ ، ئەگەر لەو کاتەدا کە ئیمام ( الله اکبر )ی تری کرد مەسبووقەکە لە فاتیحەدا بوو ئەوە تەرکی باقی‌مەندەی فاتیحەکەی بکاو شوێنی ئیمام بکەوێو ، لە پاش سەلامی ئیمام هەرچی لەسەر ماوە لە خوێندنی فاتیحەی پاش ( الله اکبر )ی یەکەمو تەکبیرەکانی‌تر بە خۆیانو زیکرەکانیانەوە هەموویان بخوێنێ •

بەڵام فەرموودەیەکی ئیمامی شافیعی هەیە کە تەنها ئەو تەکبیرانەی لەسەری مردوون یەك لەسەریەك بیانلێ‌و سەلام بداتەوە ...

بزانن هەرچی شەرتی نوێژەکانی‌ترە بۆ نوێژی مردوویش شەرتە زیاد لەوانە بەشەرت گیراوە ئەو کەسانەی نوێژی مردوو ئەکەن پیاو بن چونکە ئەم نوێژە بە ژن پێك نایەت ، مادام لەو شوێنەدا پیاو یان منالی نێرینەی خاوەن تەمیز ببێ ، ئەگەر پیاو یا منالی نێرینەی خاوەن تەمیز نەبوو ، پێویستە ژن نوێژەکە بکاو فەرزەکە بەوە دێتەجێ . سونتەتە بە جەماعەتیش بکرێ‌و ڕیزی جەماعەت سێ صەف بێ ، ئەگەر لەپاش نوێژی مردوو خەڵکی‌تر پەیدابوون پێویست نی‌یە نوێژی لەسەر بکەن ، بەڵام سونتەتە ئەوانیش نوێژی لەسەر بکەن ، شەرتە نوێژی مردوو لەپاش شۆردنی مردوەکە بێ بەتەواوی ، بەڵام کەراهەتی هەیە لەپێش کفن‌کردنی بێ . بەم شەرتە پۆشندەیەك بەسەر عەورەتی مردووەکەوە بێ کە هەموو لەشی ژن‌و مابەینی ناوك‌و ئەژنۆی پیاو داپۆشێ ، ئەگەرنا نوێژەکە بەتاڵەو کردنەکەی حەرامەو شەرتە هیچ پیسی‌یەك بە لەشی مردووەکەو کفنەکەیەوە نەبێ ، حەتتا تابووتی مردووەکە ئەبێ پاك بێ بەو مەرجە مردووەکەی پێوە بەسرابێ وە ئەو بەرگەش کە پێچراوە بە مردووەکەوە ئەبێ پاك بێ ، بەڵێ خوێنی ئینسانی کوژراو کە بەدەوام لە لەشیەوە بێت عەفوەو مانیعی نوێژ لەسەر کردنی نی‌یە هەروا ئەو تابووتەی کە مردووەکەی تیایە ، بەڵام پێوەی نەبەسراوەو ، مردوو کفنەکەی پیس نەکا مانیع نی‌یە لە دامەزراندنی نوێژکردن لەسەری ، شەرتە لەکاتێکا نوێژکەر نوێژی مردووی حازر بکا جەنازەکە لەپێشیەوە بێ ، ئیتر شەرت نی‌یە مردووەکە لەعاستی سوجدەگای نوێژکەرەکەدا بێ ، هەروەها پێویست نی‌یە مردووەکە ڕووەو قیبلە دانرابێ . ئەگەر لەسەر قەبرەکەی نوێژی لەسەر کرا شەرتە قەبرەکەی لەپێشەوە بێ ... دروستە نوێژ

لەسەر مردووی ( غائب ) نادیار بکرێ هەرچەند شوێنی مردوە کـــە نە ئەویتە لای قیلەوە ، یا نوێژکەرەکە ئیی پیش کەوێ •

مەبەس لـە مردووی نادیار ئەوەیە لـە شوێنێکدا بێ کـە نیسبەت نەدرێ لـە شوێنی نوێژکەرەکە ، کەواتە هەر مردوویەك لەناو شووورای شاری نوێژکەرەکەدا بێ بە حازر ئەناسرێ لەو شارەداو نوێژی نادیاری بۆ ناکرێو پێویستە نوێژکەرەکە بڕواتە سەر جەنازەکەی ، هـەروەها چەند دێهاتی وەها کە تیکەلی یەك بن بە یەك جێکە ئەناسـرێنو نوێژی غایب بۆ ئەهلی یەکێ لەو دێیانە لەسەر مردووی دێـکەی‌تر ناکرێو پێویستە بڕواتە لای قەبرەکەی •

بزان فەرزی نوێژی جەنازە بە تاقە پیاوێ پێکـدێت • جەماعـەت .مەرت نی‌یە بۆ نوێژی جەنازە ، بەلکو سونەتە •
هەروا سونەتە نوێژکەرەکان بە سێ ڕیز بوەستنو هەموویان دوعای خەیر بۆ مردووەکە بکەن• واجبە ئەم نوێژە پێش دفن کردن بێ ، ئەگەر وەها ڕێکەوت کە بەر لە نویژ لەسەرکـردن دفن‌کـرا دروسـتە پێش دفنیش نوێژەکەی بکرێ بەوشەرتە ئەوکەسەی کە نوێژەکە ئەکا لەکاتی مردنی مردووەکەدا ئەهلی ئەو نوێژە بووبێ یانێ باڵغو عاقڵو موسوڵمانو پاك بووبێ •

## شەهید ناشۆررێ

بزانن شەهید ناشۆررێو نوێژیشی لەسەر ناکرێ ••• شـەهید بـە کەسێ ئەڵێن لە شەڕی کافرانا بە هۆی شەڕەکەوە کوژرابێ ، ئەگەر بـە دەردێکی تایبەتی مرد ، یا لە شەڕەکەدا موسوڵمان کوشتی ، یاخود کافرەکان لە شەڕەکەدا بریندارنیان کردو لەپاشا مرد ، ئەوە بە شـەهید ناناسرێو ، پێویستە بشۆررێو نوێژیشی لەسەر بکرێ هەروەها کەسێ

بە شەڕی ئەوانەدا بکوژرێ کە لە ئیمامی ئەلی موسولمانان یاخی بوون کە ناویان ئەبرێ بە ( بغاة ) • ئەگەر ئینسانێکی لەش پیس شەهید کرا ەوە فەرموودەی ڕاست ئەوەیە ناشۆررێ ، بەلام هەر پیسی یەکی غەیری خوێن و زامی کاتی شەڕ بە لەشی شەهیدەوە بێ ، پاک ئەکرێتەوە • شەهید ئەبێ بە بەرگە خویناوی یەکەی خۆیەوە دفن بکرێ ، جا ئەگەر هەموو لەشی دانەپۆشی ئەبێ ئەوشوێنەی کە بەدەرەوەدیە بە پارچەیەکی تر داپوشرێ •

پێویستە بزانن ، کە بیرو باوەڕی ئیمامی ئەعزەم ( ابو حنیفه ) لەسەر ئەوەیە کە وەکو کوژراوی جەنگی کافران شەهیدە ، کوژراوێ کە بەناحەق بە تێغ یا بە ئالەتی ( جارحه ) بریندار کەر بکوژرێ ، وە بەو برینەوە ئەوەندە بمێنێتەوە کە خواردەنی بخوا ، یا ئاو بخواتەوە ، یا بنوێ یا دەرمانی بکرێ ، ئەوە شەهیدە ، خواە کافری حەربی کوشتبێتی یا ئەوا ەی کە یاخی ئەبن لە گەورەی موسولمانان ، یاجەردە ، واتە ئەوانە کە ڕێگە ئەگرن لە موسولمانانو ئەیان کوژن، یا دز کە لە شەوا بێن بۆسەر مالانو لەکاتی مودافەعە لە نەفس یا لە مال دزەکە بیکوژێو دیار نەبێ کێ یە ، هەروەها ئەگەر دوو کۆمەل لە موسولمانان بچن بە گژی یەکداو، هەرکام لەوانە خۆی بە خاوەن حەقو بەرامبەرەکەی بە زالمو ستەمکار دابنێ ، ئەوە هەر موسولمانێ لەو جەنگەدا بکوژرێ ئەویشە شەهیدە ، بەتایبەتی ئەگەر یەکێ لەو دوو کۆمەلە داوای صولح بکاو ئەولاکەیان وبالاتی پێ نەکا ، ئەوە کوژراوی ئەم کۆمەلە کە داوای صولح ئەکەن ، وەکو شەهیدی حەربی کافران وایە ، وەحوکمی شەهید لەلای ئیمام ئەبوو حەنیفە خوای لێ ڕازی بێ ئەمەیە کە کفن ناکرێنو ناشۆرێن • بەلام نوێژیان لەسەر ئەکرێ ،وە دەلیل بەوە دێننەوە کە حەزرەت (ص) نوێژی لەسەر حەمزەی مامی و لەسەر شوهەدای بەدر کردووە ، بەلام ئیمە ئەلێین

ئەوە هەر دوعاکردن بووە بۆیان ، وە ئەم نوێژە مەشهوورە نەبوە ، ئـەم باسە بڕایەوە ... ئەگەڕێمەوە بۆ سەر مەزهەبی ئیمامی شافیعی خـوای لـێ ڕازی بێت ، کەسـێ خۆی کوشتبێ ئەشوردرێو نوێژی لەسـەر ئەکرێ وەکو باقی موسوڵمانان . بۆ ئیمامەت لە نوێژی مردوودا باوکو باپیرەو باقی ( عصباتی ) نەسەبیان باشـترە لـە فەرمـانداری شـەرعیی ولاتەکە ، ڕیزی عەصەبات ئاوایە : باوك ، باپیر ، باپیـرە گەورە ، کوڕ ، کوڕەزا ، برای باوكو دایـکی ، برای باوکی ، برازای کـوڕی برای باوكو دایکی ، تا ئەڕوا لەسەر شێوەی میرات گرتن ، ئەمجار خزمـانی غەیری نەسەب ، ئەگەر دووکەس لە پایەیێکدا بوون ئەوە کامیان پیرترە یـا لوخواترس تر بوو ئەوەیان ئەبێ بە ئیمام .

سوننەتە ئەوکەسە نوێژی مردووەکە ئەکا لەعاستی سەری پیـاوو سێ بەندەی ژندا ڕاوەستێ . سوننەتە هەڵگرتنی جەنازە بە سێ کەس بێ یەکێك لەپێشەوە ، وە دووکەش لەپاشەوە ، ئەوکەسە وا لەپێشـەوە ، هەردوو داری تابووتەکە بخاتە سەر هەردوو شانی ، وە ئەو دوو کەسەش کە لەدواوەن یەکی دارێ لەو دارانە بخەنە سەرشانیان، ئەم شێوەیە خێری زۆرترە لەوە کە دوو کەس لەپێشەوەو دووکەس لەپاشەوە بن .

سوننەتە سەری مردوەکە لـە تابـووتا لـەپێشـەوە بێ ، وە کاتێ گەیشتە سەرقـەبران وا دابنرێ سەری مردووەکـە بکەوێتە لای پێی قەبرەکەوە ، بۆئەوەی لەوکاتەدا ئەخرێتە قەبرەوە ، لەلای سەریەوە بـە ئارامی دایکێشنە ناو قەبرەکەیەوە. سوننەتە (تشییع) بەرێ کردنی جەنازەو ڕۆیشتن بە پیادە لەپێشی جەنازەکەوە باشترە لە ڕۆیشتن بەسواری یـا ڕۆیشتن لەپاشەوە مەگەر لەبەر عوزرێـکی مەعقوول ، وە سـوننەتە بـە پەلەپەل ببرێ ئەگەر ترسی گۆڕانی جەنازەکە نەبێ ، ... وە سوننەتە شتێ

بدرێ بەسەر جەنازەی ژندا بۆئەوە داپوشێ ٠

کەراهەتی هەیە دەنگ بەرزکردنەوە ، لەگەڵ جەنازەدا ، هەروا لە کاتی شۆردنو نوێژکردنو کفن کردنیا دەنگ بەرزەوە کردنو قەرەبالغ کردن ٠ سوننەتە لە شوێنێکی پاکدا دانرێ تا قەبرەکەی تەواو ئەبێ ٠ هەروا کەراهەتی هەیە ئاگر هەڵگرتن بە شوێنی جەنازەدا ، مەگەر وا ڕێککەوێ کە شەو دفن بکرێ ، بۆ ڕووناکی وەیا بۆ دەفعی سەرماو سۆڵە ٠

دفنی مردووان لە واجبیاتە
لە واجبیاتا لە موهیمماتە
ئینسان بە قەزا لە هەرکوێ بمرێ
هەر لەو شوێنەدا با دفن بکرێ
حەرامە نەقڵی بۆ مەقبەرەی دوور
بە بێ سەبەبی ڕووداوی زەروور
بەڵێ کە ترسی گۆڕانت نەبێ
ڕەوایە نەقڵی مردوو جێ بەجێ
بۆلای باوکو دایكو خزمو براکان
یا قەبری یەکێ لە صالحەکان
بەڵام پاش دفن حەرامە حەرام
دەرهێنانی لەش بە یاسای ئیسلام
مەگەر قەبرستان هەڵگرن تەواو
یا ترست ببێ لە غەرقی بە ئاو
یاخود غەصب بێ جێگەی قەبرەکەی
یابۆ ئەوە ڕووی بەرەو قیبلەکەی

نەقلی ڕوفاتی وڵات بەووڵات
حەرامە لە سەر دەلیلو ئیسبات
ژنی حاملە دفن ناکرێ
نەك حەملی زیندوو لەسکیا بمرێ
بە عەمەلیات با زوو بێتەدەر
با بۆ خۆی بژی بە سوودو سەمەر
ئەگەر مردبوو لە سکی ئەوا
دفن قەیناکاو ئەمێنێ لەوا
مردوو بنێژن لە جێگەی چاکا
مولکی کەس نەبێ لە ناو ئەملاکا
جێگە قەبری باش لای پیاوی پاکە
دراوسێی صالح دراوسێی چاکە
ئینسانی پیرۆز خودا لێ‌خۆشبوو
باشە بۆ ڕەفیق بە نصیبت بوو
وە ( توفنا مع الابرار )
ئیشارەتێکە بۆ صوحبەت کاری
باشترین جێگەیش گۆڕخانەی گشتە
گۆڕستانی عام وێنەی بەهەشتە
لا باوكو دایكو خزمو دۆستان
قەبرت ئەبێتە وێنەی بۆستان
ڕێبوار فاتیحەت لەبۆ ئەخوێنن
دیاری ئیسلامی بۆ تۆ ئەنوێنن

نی‌یه‌تی تۆ بێ‌و دوعات بۆ بگا
یه‌قین ئه‌وابی به‌ڕۆحت ئه‌گا
فاتیحه‌که‌ی خوێند مه‌عنای ئیحسانه
که هه‌دی‌یه‌ی کرد قبوول ئاسانه
ئه‌گه‌ر بێ‌سووده بۆچ ئه‌نبیاکان
دوعایان ئه‌کرد بۆ موسوڵمانان
هه‌دییه له‌تۆو دوعا تۆ ئه‌یکه‌ی
قبووڵ له خودایش به ڕه‌حمه‌ته‌که‌ی
ئایه‌ی ( أدعوني أستجب ) به حه‌ق
مایه‌ی ڕجایه له‌بۆ مووه‌ففه‌ق
ته‌فصیلت ئه‌وێ ئه‌ی برای ئه‌مجه‌د
( طالع مسند الامام احمد )
ئه‌وی مونکیره با بڕوا بمرێ
قاپی ڕه‌حمه‌تی خودا چۆن ئه‌گرێ
دوو یاسای هه‌یه خودا بۆ ئوممه‌ت
یه‌که‌م یاسای فه‌ضڵ دووه‌م عه‌داله‌ت
جه‌زای خیری خۆت له عه‌داله‌ته
جه‌زای خێری خه‌ڵك فه‌ضڵ‌و ڕه‌حمه‌ته
هه‌روا دیاری خێرو صه‌ده‌قات
چ له‌بۆ ئه‌حیا چ له‌بۆ ئه‌موات
بخوێنیته‌وه ئایه‌ی سووره‌ی طوور
سه‌رانسه‌ر دڵت دائه‌گرێ به نوور

با قەبری مردوو گەورەو ڕەسا بێ
قوولی ئەوەندەی بەرزی بالا بێ
دەستی بەرزیشی بهاوێتە سەر
ئەمەیە یاسای ئیسلامی ئەنوەر
جا ئەگەر زەوی توندو مەحکەمە
ئەلحەد چاترە لادرە ئەمە
مردووی تێ هاوی لەسەر شانی ڕاس
بەرەو ڕووی قیبلە ( كعبة الله )ی خاص
فەتحەی پشتەکەی بگری سەراسەر
جا خاکی تێکەن تا ئەگاتە سەر
ئەگەر نەرمیشە خاکی ئەو شوێنە
لەسەر گۆڕیچە شێوەی بنوێنە
لەو حالەیانا هەلی ئەکەنێ
بە قەدەر لەشی ئەو گۆڕ هەلئەچنی
مردوو ڕاکێشن بێ ئیش‌و ئازار
بە یاسای ئەدەب لەسەر ئیعتیبار
حەوت جار بخوێنن « انا انزلنا »
بە مشتی خاکاو بیکەن بە سەریا
کە ڕاتان کێشا دل لە بۆی گریا
خشتێ دابنێن لە ژێری سەریا
کفنی ڕووی لادەن هەتا ڕوخساری
دەربخا لە بۆ خودای غفاری

ئەگەر ئەو عەرزە وەك ئاوە زێیە
بۆ مردوو تابووت بەشەرع بەجێیە
لە تابووتیشا داینێن لەسەر شان
ڕووبەڕووی قیبلە « كعبة الرحمن »
ئەنا واجبە كە تابووت بشكێ
ڕووی هەڵسووڕێنیو بەرەو قیبلە بێ
كە لامان هەر لای ذاتی خودا بێ
با ڕوومان بەرەو ( كعبة الله ) بێ
لامان هەر لەلای ذاتی خودایە
قیبلەمان بەیتی ( كعبة الله )یە
پاش ئەمە خاكی بكەن بەسەرا
تەواو ببشێلن لە سەرو بەرا
هیچ مانیع نیە لە كێلی قەبران
سێ لە بۆ پیاوو دوو لە بۆ ژنان
ئەگەر ئەو عەرزە لە ئاوەزێیە
تابووت بۆ مردوو گەلێ بەجێیە
ئەنا هەر كفن بەشێكە وافی
( حسبنا الله ونعم الكافی )
دوو كەس لە قەبرێ ئەگەر مەحرەم بن
كارێ مەكرووهە گوێ بگرن لە من
كە نامەحرەم بن ( قطعاً ) حەرامە
خیلافی دینی پاكی ئیسلامە
قەبری كۆن ئەگەر مردوو ڕزابێ
بۆ مردووی تازە ئەبێ ڕەوا بێ

دفن لە شەوا غەیرە مەکرووهە
لای هەندێ زانا کاری مەشبووهە
بەقەدەر بستێ قەبری موسولمان
بەرز ئەکرێتەوە لەبەر نەزەرمان
بەڵام وا باشە کە ( مسطّح ) بێ
نەك ( مسنّم ) بێ لە لات ( أصح ) بێ
( مسنّم ) واتە ناوەڕاست بەرزە
ئەملاو ئەولاکەی ڕێکی ڕووی عەرزە
پاش دفنی مردوو بە یاسای ئەدەب
تەڵقینی بکەن پوختەو مورەتتەب
مەلا بەرەوڕووی مردوو دانیشێ
دڵ پاك کاتەوە لە هەموو ئێشێ
خەلکیش ڕاوەستن هەموو گوێ بگرن
بیربکەنەوە ئەوانیش ئەمرن
بڵێ : ئەی برای دینو ئایینم
ئەی خۆشکی خاوەن حەیاو تەمکینم
تۆی وا جیگەت گرت لە تەختی قەبرا
دوورکەوتیتەوە لە خزمو برا
فەرامۆش مەکە عەهدو پەیمانت
یاسای ئیسلامیو دینو ئیمانت
دوو فریشتە دێن لە بۆ پرسیار
لە دین لە ڕەهبەر لە پەروەردگار

به زمانی پاك بلێ بەوانە
خودام ( الله ) یە خودای جیهانە
( محمد ) خاوەن ئایاتی قورئان
پێغەمبەرمانە بۆ ئاخر زەمان
هەرچی فەرمووە وەرم گرتووە
دڵم ئەوانەی ون نەکردووە
مردوو لە تەلقین بە حەق تێ ئەگا
ڕۆحی لە مانای ئاگایە ئاگا
مردوو ئاگایەو زیندوو نوستووە
دونیا دەروازەی دڵی بەستووە
ماوەی مابەینی دونیاو قیامەت
ناوی بەرزەخە بە یاسای لوغەت
ڕۆح والە کارا جیسمی بەرزەخی
چ بۆ بەهەشتی چ بۆ دوزەخی
جیسمی بەرزەخی وەك جیسمی جبریل
لەو کاتا ئەهات بۆ وەحیو تەنزیل
قەبریش باخێکە لە باخی بەهەشت
یاخود دۆزەخە بۆ مەردی بەرگەشت
تێفکرن مەعنای فەرموودەی ڕەهبەر
لە دوعای ( تثبیت ) ببن باخەبەر
( ان الانسان یسئل ) ڕاسە
ڕێگای ئینسانی حەقیقەت ناسە
کە بەجێیان هێشت هەندێ لە خزمان
ڕاوەستن لەویا ڕوبعێ لە زەمان

ئەبێ بە چاری وەحشەتی ڕۆحی
ئەبێ بە مایەی دەرك و فتووحی
ئەمە سوننەتە بە یاسای ئیسلام
ڕۆح بەم مانەوە ئەگا بە مەرام
ئەمجار ئەرکەسەیش بڕواتەوە ماڵ
بیدەنە دەستی خودای ( ذی الجلال )
لە قەبرستانا عەرز دامەگرن
کارێ حەرامە خووی پێوە مەگرن
پێویستێ نییە بە بینای مردوو
مەیکەن بە خانووی پاشای ڕابوردوو
ئەوەن پێویستە شوێنی مەعلووم بێ
شەخسی گەورە بێ و طفلی مەعصووم بێ
بەڵێ داری تەڕ بڕوێنن لەوێ
یا گوڵی بۆن خۆش ئەگەر ڕێکەوێ
گیاو داری تەڕ لەویا بمێنن
بە زیکری خوا ڕەحمەت ئەنوێنن
ئەمە فەرموودەی زاتی حەزرەتە
بۆ خاوەن ئیمان مایەی عیبرەتە
باوەڕتان ببێ کە ڕەحمی خودا
لەسەر خێراتە لە ڕۆژو شەودا
نانی داماوی بەرگی هەتیوی
نەك صەرفی پارە لەدۆڵو شیوی

لای کەمی قەبر چاڵێکی وایە نەیەڵێت بۆنی مردووەکە بێتە دەرەوەو مەنعی دڕندە بکا لەوە کە مردووەکە دەرکێشێتە دەرەوە • سوننەتە قەبر ئەوەندە ڕەسا بێ بە ئاسانی جێگەی مردووەکەی تیا بێتەوە ، وە ئەوەندە قووڵی بێ کە ئینسانێکی نەکورتو نە درێژ لەناویا ڕاوەستێ هەردوو دەستی هەڵبڕێ ئەوسا بگاتە لێوارەکەی ، جا ئەگەر ئەو زەوی‌یە ڕەق بوو واچاکە قەبرەکەی ( ئەلحەد ) بێ ، واتە لادڕ بێ ، یانی لە لای قەدی قەبرەکەوە زەوی‌یەکە بەقەد لەشی مردووەکە هەڵبدڕنو مردووەکەی تێ‌خەن •

ئەگەر زەوی‌یەکەی نەرم بێ ، هەر لە ناو چاڵەکەدا گۆڕێچەی بۆ دوروست بکەن ، ئەوجار مردووەکە کە لای پێی قەبرەکەدایە ، بەنەرمی لە لای سەریەوە ئەهێنرێ بۆ ناو قەبرەکە • سوننەتیشە ئەوکەسانە کەئەم ئیشە ئەکەن ، ئەوانەبن کە نوێژەکەیان لەسەر کردوە ، وە هەر ئەوکەسانە جلێ بێنن بیدەن بەسەر قەبرەکەدا تا مردووەکە لە جێگەی خۆیا دائەمەزرێنن ، بەڵێ بۆ ژنێ کە شووی هەبێ شووەکەی لە هەموو کەس چاترە بۆ داهێشتنی بۆ ناو قەبرەکەی ، جا ئەگەر قەبرەکەی لادڕ بوو لەسەر لای ڕاست ڕای‌بکێشنو پاڵی‌بدەن بەوپەڕی قەبرەکەوەو ڕووی لە قیبلە کەنو پشتەکەی بە خشت یابە بەرد بگرن • ئەگەر بە تەختەداریش بێ هەر باشە • جا قەبرەکەی بەسەرا پڕبکەنەوە سوننەتە خشتێ بخەنە ژێر سەری مردووەکەوەو ڕووی لە قیبلە بێ • سوننەتە بۆ ئەوکەسە کە لە قەراغی قەبرەکەدایە سێ مشت خۆل لە خۆڵی گۆڕەکە هەڵگرێ بەسەر یەکەمیانا ( منها خلقناكم )و بەسەر دووەمیانا ( ومنها نعيدكم ) و بەسەر سێهەمیانا (ومنها نخرجكم تارة أخرى) بخوێنێو لەپاشان ئەو مشتە خۆڵانە یەکەبەکە

بکاتە خوارەوە بۆلای سەری مردووەکە • هەروەها سوننەتە یەکێ مشتێ خاك هەڵبگرێو حەوت جار ( انا انزلنا )ی بەسەرا بخوێنێ تا ئاخری سوورەتەکە ، ئەمجا ئەو خۆڵە بکا بەسەر کفنەکەیا • جا پاش ئەمە خوڵ بکرێتە قەبرەکەوە تا پڕبێتەوە ، سوننەتە قەبرەکە بەقەدەر بستێ بەرزبکرێتەوە بەڵام بەرزی‌یەکەی واباشە لە سەرو خوارەوە رێک بێ ، نەک لە خوارەوە تەخت بێو لە سەرەوە باریک بێ • سوننەتە یەکێ لەوانە کە مردووەکە ئەخەنە ناوقەبرەکەوە بڵێ ( بسم الله ومن الله وعلى ملة رسول الله ) ، هەروەها سوننەتە هیچ فەرش لەژێر مردووەکەدا ڕانەخەن • کەراهەتی هەیە مردوو لەتابوتا بخەنە قەبرەوە مەگەر خاکەکەی نمدارو ڕووخەك بێ • سوننەتە سەری قەبرەکە ئاوڕشێن بکرێو بکوتنەوە و حەدت بەردی بچووك بەڕیز لەسەر قەبرەکە دابنرێنو لەلای سەریەوە کێلێکی بۆ داکوتن ، ئەگەر بەردێکیش لەلای پێیەوەو ، بەردیکیش لەناوەڕاستی قەبری پیاودا هەبێ باشترە بۆ ئەوەی قەبری پیاو لە قەبری ژن جیا بکرێتەوە ، بەڵکو ئیحسانە • هەندێ لەزانایانی شەرع ئەڵێن ئەمەیش بەقیاس لەسەر بەرد دانانی حەزرەتە (ص) لەلای سەری مردووەکەوە کە لە پاش دفنی عوسمانی کوڕی مەطعوون بەردێکی هێناو لەسەر حاستی سەری عوسمان لە سەر قەبرەکەی دایمەزراندو فەرمووی بەم بەردە قەبری عوسمان دیاری ئەکەم بۆ ئەوە کاتێ هاتم بۆ زیارەتی لێم ون نەبێ • سوننەتە پاش داپۆشینی قەبرەکە ئیمام تەڵقینی مردووەکە بکا ، بەم جۆرە لە بەرەو ڕوویەوە دانیشێ پشت لە قیبلە بکاو ، خەڵکەکەیش ڕاوەستنو بڵێت ( يَا عَبْدَ اللهِ ابنَ اَمَةِ اللهِ اذكُر العَهْدَ الّذي خَرَجْتَ عَلَيْهِ مِنَ الدُّنيا، وَهُوَ شَهَادَةُ اَنْ لا اِلهَ اِلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَاَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ ، وَاَنَّ الْجَنَّةَ حَقٌ ، وَاَنَّ النَّارَ حَقٌ ، وَاَنَّ الْبَعْثَ حَقٌ ،

وأنَّ السَّاعةَ آتيةٌ لا رَيْبَ فيها ، وأنَّ اللهَ يبعثُ مَنْ في القُبورِ ، وأنكَ رَضيتَ باللهِ رَبّاً ، وبالإسلامِ ديناً وبمحمدٍ (ص) نبيّاً ورسُولاً ، وبالقرآنِ اماماً وبالكعبةِ قبلةً وبالمؤمنين اخواناً • رَبيَ اللهُ لا اله الا هُوَ عليهِ توكّلتُ وهُوَ ربُّ العرشِ العظيم ) سونَنەتە ئەمە سێ جار دووبارە بکرێتەوەو سونەتە لەپاش تەلقینەکە هەموو خەڵکەکە دوعای ( تثبیت ) بکەن بۆ مردووەکە ، واتە دوعای ئەوەکە خوای تەعالا زمانی ئەو مردووە دابمەزرێنێ بەجۆرێ کەوەڵامی فریشتەکان بداتەوەو سونەتە ئەم کۆمەڵە کە دوعاکە ئەخوێنن چەند دەقیقە لەسەر قەبرەکە ڕاوەستن •

وەئەگەر هەموویان ڕانەوەستان یەکێ لە خزمو برایانی کابرا ڕاوەستێ بۆ ئەوە کە ئەو مردووە لە وەحشەتی قەبر دەرچێ • سونەتە تۆڕخانەی هەر خێزانێك پێکەوە بێ • دروست نی‌یە لەپاش دفن قەبر هەڵدرێتەوە مەگەر ماڵی کەسێکی تێ‌کەوتبێ ، هەروا دروست نی‌یە هەڵیبدەنەوەو مردووەکە بگوێزنەوە مەگەر لەبەر ناچاری‌یەك وەکو ئەوە ئەو ئەرزەی تێدا نێژراوە ئەرزی یەکێکی‌تربێ و داگیر کرابێ بۆ قەبر ، یا مردووەکە بە نەشۆراوی خرابێتە قەبرەوە ، وە هێشتا لەشی تێك نەچووبێ ، ئەگینا دروست نی‌یە دەری بێنی ئەگەرچی نەیشۆرابێ بەڵام ئەگەر مردووەکە ڕووی لە قبیلە نەکرابێ ، ئەوە پێویستە ئەو قەبرە هەڵدرێتەوەو ڕووی مردووەکە لە قبیلە بکرێ وە دروست نی‌یە مردوو لەپێش دفن کردنیشا لەو شوێنەی تیا مردووە بگوێزرێتەوە بۆ شوێنێکی‌تر، مەگەر بە دوو مەرج یەکەم ترسی گۆڕانی بۆنی مردووەکەت نەبێ ، دووهەم بۆلای قەبرستانی باوك دایكو خزمو برای خۆی ببرێ ، وەیا بۆ قەبرستانی یەکێ لە پیاو چاکان کە بە تەقواو خواپەرستی بەناوبانگ بووبێ ، یاخود ئەو مردووە نزیك بێ لە مەککەوە یا مەدینە یا ( مسجد

الاقصى ) زادها الله شرفا •

دروست نی‌یه دوو مردوو بخرێنه قه‌برێکه‌وه مه‌گه‌ر له‌به‌ر ناچاری ، له‌م حاله‌ته‌دا کامیان گه‌وره‌تره ئه‌خرێته پێشه‌وه •• به‌ڵی دوو که‌س که مه‌حره‌م بن به‌یه‌ك وه‌کو باوك‌و کوڕ یا دوو برا یا ژن‌و مێرد ئه‌وه دروسته له قه‌برێکدا دفن بکرێن به‌لام مه‌کرووهه • ناشتنی مردوو له گۆڕستانی گشتی‌دا باشتره له دفنی له‌شوێنی تایبه‌تی وه‌کو خانووی ناو ئاوه‌دانی ، •• چونکه له گۆڕستانی گشتیدا مردووی صالح زۆره وه ڕێبواریش فاتیحه‌یان بۆ ئه‌خوێنن وه یاسای ئیسلامیش له‌سه‌ر ئه‌وه هاتووه بۆ ئێمه • به‌ڵێ ئه‌گه‌ر سوودێکی شه‌رعی ببێ له‌وه‌دا که به‌تایبه‌تی دفن بکرێ ئه‌وه باشه ، وه‌کو ئه‌وه کوڕێکی ببێ بی‌یه‌وێ قورئان له‌سه‌ر قه‌بره‌که‌ی بخوێنێ وه‌له خانوودا بۆی بکرێ • دروست‌نی‌یه بینای قه‌بر چ له‌ناو قه‌بره‌که‌وه‌و چ له‌ده‌ره‌وه‌مادام له قه‌برستانی گشتی‌دا بێ ، چونکه ئه‌بێ به‌هۆی داگرتنی عه‌رزی مه‌وقووفه‌ی قه‌برستانه‌که‌و ئه‌ویشه حه‌رامه ، به‌لام بینای قه‌بر له مولکی خاوه‌نه‌که‌یا ئه‌وه ئه‌گه‌ر له‌به‌ر ناچاری بێ (مثلا) بۆ ده‌فعی ئاو یا دوژمن یا دڕونده یا شتێکی‌تر ئه‌وه دروسته ، به‌لکو له هه‌ندێ ( مادة )دا واجبه ئه‌گه‌ر ناچاری نه‌بوو ئه‌وه مه‌کرووهه •

به‌ڵێ هه‌ندێ له فوقه‌ها فه‌رموویانه له گۆڕستانی گشتیشا دروسته ؛ چونکه وه‌قفی عه‌رزه‌که بۆ قه‌بر ، مه‌عنای ئه‌وه‌یه هه‌رچی بۆ قه‌بر پێویست بێ ئه‌کرێ بۆ پاراستنی مردوو له دڕنده وه له ڕووخانی قه‌بره‌که‌و له هه‌ڵدانه‌وه‌ی خه‌ڵکی بۆ ئه‌وقه‌بره له‌کاتی (اشتباه) دا • ئیسته ئه‌گه‌ر ئه‌و قه‌بره له‌ناوه‌وه‌و له‌ده‌ره‌وه قایم نه‌کرێ زۆر نابا که‌ئه‌و قه‌بره ئاثاری نامێنێ ، به‌لکو خه‌ڵکی به ناحه‌ق ئه‌و قه‌بره وێران ئه‌که‌ن‌و مردوویه‌کی تازه‌ی تێ ئه‌خه‌ن ••• ( فقط ) له‌م صووره‌ته‌یشا دروست‌بوونه‌که ( مقيدة ) به ئه‌ندازه‌ی پێویسته‌وه ، دروسته بۆ که‌س‌و

گاری مردوو یا دۆستو برادەرانی ڕوخساری مردووەکـە ماچبکەن •
سوننەتە خەبەردان بە موسوڵمانان تـا لـە مردنی کابرا ئاگابینەوەو ئامادەی
تەشییعی جەنازەیو ڕەوانەکردنی بۆ سەرقەبران بین •

بەڵام بانگەواز کردنو تاریف کردنی مردووەکە حەرامە • دروستە
گریان لەسەر مردوو بەئەدەب چ لەپێش گیان دەرچوونی وەچ لـەپاش
گیان دەرچوونی ••• بەو مەرجە لەگەڵ هاوارو لەسنگدانو قوڕپێوانـا
نەبێ ، یەخە دادڕینو موبڕینو بـەرگی ڕەش لەبەرکردنو گۆڕینی
بەرگو پۆشاکی عادەتی هەموو ئەمانە حەرامن ، هـەروا درێژەدان بـە
ماتەم زیاد لەسێ ڕۆژ حەرامە ، هەروا تازەکردنەوەی ماتەم لـە جـەژنی
یەکەمی پاش مردنی کابرا یا لەپاش تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەریا ، هەموو
ئـەم یاسایانە حەرامنو لە لایەنی یاسای زەمانی جاهیلییەوە ، وە لەلایەن
کفرەکانەوە هاتووەو بۆ ئێمە ماوەتەوە ••

سوننەتە لەبۆ گەلی دراوسێ
ئەوەی ئایینی ئیسلام ئەناسێ
نان دوروست بکا بۆ ئەهلی مردوو
ئیلحاحیش بکا بیخۆن زووبەزوو
لای ماڵی مردوو خواردنی طەعام
بێ دەلیلی دین حەرامە حەرام
دەلیل سیانە یەکەم وەصییە
بۆ خواردەمەنی گەلێ تەعزیە
بە عیبارەتێ دوور بێ لە تاوان
نەك بۆ ژنانی گۆرانیو گریان
ئەمەی فەرمووە ( شیخ ابن حجر )
لە جەنائیزدا ( تحفە )ی موعتەبەر

دووهەم ئەمەیە لەسەر دەستەوام
ئەهلی ئەو شوێنە دروست کەن طەعام
بڕیاری بدەن بە فیکری خۆیان
نان‌و چێشت بدەن بە کەلی میوان
جا هەرکەسێ مرد لە خەڵکی ئەو دێ
نانی تەعزیە وەها بێتە جێ(١)
سێهەم ئەمەیە کە ئەو کەسانە
تەعزیە ئەکەن لەو برایانە
لەپێش خۆیانا مادە بنێرن
بە خاوەن کاری مردووی بسپێرن
تا ئەمان ئەڕۆن نانیان بۆ ئەکەن
بەشی ئەوان‌و خەڵکی تر ئەدەن
ئەگەرنا چ بکەین لە ئینسانی دوور
دێ بو تەعزیە ناچارو زەروور
تا ببەتی وەکو خزم‌و براکان
یادۆستی ڕاستی بۆ مردووەکان
ناچارین لە بۆ نانی ئەمانە
زەحمەت بکێشین بەپێی زەمانە

## تەعزیەو دانیشتن لەبۆ تەعزیە

تەعزیە کردن لە گەڵی مردوو
سوننەتی دینە بە بێ یەک‌و دوو

---

(١) باسی ( جنائز ) لە کتابی (الانوار) •

یاسای ئیسلامەو سوننەتی دینە
مایەی دڵخۆشی برای ئایینە
بەڵام دانیشتن لە بۆ تەعزیەیە
نەبوە لەعەسری ( خیرالبریە )
هەرچەند مەشهوورە کە زاتی ڕەهبەر
دانیشت لە مزگەوت پاش مەرگی جەعفەر
یاران تەعزیەی ذاتی ئەویان کرد
ئەمە ثابیتە باش تێفکرە ورد
کە دونیا گۆڕا بە مایەو غایە
ئیمامی ( مالك ) فەرمووی ڕەوایە
هەروا ڕەوای‌دا ئیمامی ئەعزەم
دانیشتن لەبۆ تەعزیەو ماتەم
چ لەناو ماڵا یاخۆ لە مزگەوت
یا جێی تەعزیە هەرچۆنی رێکەوت
( واقعا ) مردوو عەلاقەدارە
بە ئەوەی خزم‌و براو غەمخوارە
گەلێ زەحمەتە ئەوە دامەزرێ
کە کەس نەپرسێ لەوکەمە ئەمرێ
عەلاقەی دۆستی ئەبرێ لەناوا
ڕەنجی چەند ساڵە ئەدرێ بەئاوا
بەلام بقامن بە یاسای شەرعی
تەعزیە بکەن لە ئەصڵ‌و فەرعی

بەم هاتوچووە دلیان خۆش ئەبێ
ئێشی مەرگی باب فەرامۆش ئەبێ

## قورئان خوێندن لە تەعزیەدا

لە تەعزی‌یەدا خوێندنی قورئان
گەلێ بەسوودە بۆ موسوڵمانان

یەکەم ئەو خەڵقە لە گەورەو منداڵ
دوورئەکەونەوە لە واتەی بەتاڵ

دوو بە بیستنی ئایاتی قورئان
ڕەحمەت دێتە خوار بۆ هەموو ئەوان

سێهەم بەنیازی ئەوابی مردوو
خێری بۆ ئەروا بە بێ یەك‌و دوو
بەپێی ئەو ( نصـّه ) وا لە بەرچاوا
بۆ ( ابن حجر ) ماوە لەناوا
خۆ ( ابن حجر ) جێی باوەڕ نەبێ
کۆمەڵی ئێمە مەعلووم گەڕئەبێ
ئەنجا ( قراءات ) لەگەڵ ( اهدا )دا
قورئان خوێندنە لەگەڵ دوعادا
هیچ‌کەسێ ناڵێ کە قورئان خوێندن
بێ‌خێرە کاتی ( تلاوه ) کردن
خوێندی بۆ مردوو ئەوابەکەی خۆی
لەسەر شەراکەت ( اهدا ) ئەکا بۆی

که ( اهدا )ی بکەی لە گەڵ دوعادا
مەقبووڵە بە حەق لە بارەکادا
زیاد لەمانە هەر کاری هەبێ
کە نەهیی ( شارع ) لەو کارە نەبێ
ئەوە ( اباحە ) ئەبێ بە حوکمی
ئەمە ثابیتە بەشێوەی حەتمی
ئیتر هەر کەسێ ئەم ڕێگا بگرێ
ڕێی ڕەحمەتی حەق لەسەر خۆی ئەگرێ

## باسی پرسەو قورئان خوێندنو نان خواردنی پرسە

سوننەتە بۆ دراوسێی ماڵی مردوو ، نان بۆ ماڵی مردووەکە دروستبکەن لەو شەوو ڕۆژەدا کە مردووەکەیان ئەمرێو هەوڵیشیان لەگەڵا بدەن بۆ ئەوە بیخۆن ، .. بەڵام حەرامە نان دروست کردن بۆ ئەوکەسانەی کە بە مردووەکەدا ئەخوێننو کەسو کاری ئەگرێنن .
سوننەتە پرسەو دڵخۆشیدانەوەی کەسوکاری مردوو کە کەسێکیان مردووە موسوڵمان بێ یا کافری ( ذمّی ) ، وەسوننەتە ڕۆیشتن بۆ سەر قەبران لەگەڵ جەنازەی گاور یا جوولەکە بەمەرجێ خاوەن مردووەکە موسوڵمان بێ یا کافری ( ذمی ) یانێ کافری ناو وولاتی ئیسلام ، هەروا بۆ ئەو کافرانەیش کە مامەڵەو تێکەڵی شەرعی لەگەڵیانا هەیە . حەرامە کەسانێك کە خاوەنی مردووەکەن خواردەمەنی دروست بکەن بۆ خەڵك ، بەتایبەتی ئەگەر یەکێ لە میرات بەرەکان نا ( بالغ ) بێ وەیاخود ( سفیه )و بێماریفەت بێ .

مەگەر کابرای مردوو کاتی خۆی وەصیەتی کردبێ کە ئەندازەیەك

لـه ماڵـی صەرف بکرێ بۆ خـواردەمەنی ئەوانـەی دێن بۆ پرسـە • بەومەرجە وەصیەتەکەی ئەوانە نەگرێتەوە کـە دین هـەڵئەخوێنن بـە مردوەکەدا •

ڕێگایەکی‌تر هـەیە بۆ خـواردەمـەنی پرسـەکەر ئـەویش ئەوەیە ئەوانەی ئەڕۆن بۆ پرسە ، بەقەدەر خواردەمەنی خۆیان یان زیاتر پارە یاخۆ خواردەمەنی ، وەکو حەیوانو برنجو ڕۆنو شەکرو چای بنێرن بۆ ئەو ماڵە لەپێش چوونی خویانا بە نیازی ئەوە کە خۆیـان لەوە بخـۆنو پاشماوەکەی بۆ ئەو ماڵە بێ • بەڕاستی ئەم شێوەیە گەلێك موناسبە بۆئەوەی ئینسان گیرۆدەی خواردنی حەرام نەبێ ، بەتایبەتی ماڵی هەتیو •

درێژەی ئەم باسە ئەمەیە ، ئەمڕۆ کە ترومبێل هەیەو هاتوچۆ ئاسانە، ئەوکەسانەی ئەگەنەوە ماڵی خۆیان پێویستە بگەڕێنەوە بۆ ئـەو شـوێنی خۆیانە شار بێ یا لادێ ، بەڵام بۆ ئـەوانەی کە شوێنەکـەیان ڕێـگەی ترومبێلی لەسەر نی‌یە وەیان دوورە فریاناکەون بگەڕێنەوە ، پێویستە چاری خواردنیان بکرێ بەو شێوەیە ، یا بە وەصیەتی کابرای مردوو ، وە یاخود بەهۆی ئەوماڵەوە کە پرسەکەرەکان ڕەوانەی ئەکەن بۆ ماڵی مردووەکە ، وەیا بە دەستەوام لەناو خەڵکی ئەو شوێنەدا کە بەقەدەر حاڵ نـان بدەن بەوانە کە دێن بۆ پرسەی هەر ماڵێك مردوویان لێ بمرێ •

باشتر لەناو ئەم صـوورەتانەدا ئـەوەیە کە پرسەکەرەکان لـەپێش خۆیانەوە شت بنێرن • پێویستە بزانین کە تەعزی‌یەکردن سـوننەتەو ئیحسـانە ، بـەڵام دانیشـتنی ئەهلی مـردووەکـە بـۆ پێشـوازیو بـە خێراتی ئـەوانـە دێن بۆ پرسـە سـوننەت نی‌یـە • بەڵـێ ڕیوایەتێ هەیە کە لـە پاش شەهید بوونی جەعفـەری ئامۆزای

حەزرەت ( ص) لە غەزادا لەگەڵ زەیدی کوڕی ( حارثە )دا تەشریفی لە مزگەوتا دانیشت‌و خەڵکی ئەهاتن تەعزیەیان لێ ئەکرد • لەڕاستیدا کە لە زەمانی حەزرەتا بۆ تەعزی‌یە دانەئەنیشتن مەعذوور بوون ، چونــکە ئەرکی بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام و غەزا لە ئارادا بووە ، ئەمڕۆ ئەوە نی‌یەو ، مادام ئەصڵی تەعزی‌یە سوننەتە ئیمامی ( مالك )و ئیمامی ( ابو حنیفە ) ڕەوایان‌داوە کە خاوەن‌مردووەکە لەشوێنێکدا دابنیشێ‌و خەڵکی تەعزی‌یەی لێ بکەن تاسێ ڕۆژ ، ئەمە دروستە •

## تەعزیە بیدعەت نی‌یە

مەکەونە شوێنی واتەی بێ قیمەت
کەوا تەعزی‌یە دوورە لە سوننەت
یانێ بیدعەتەو دوورە لە ئیحسان
واتەی نەفامەو شەریعەت نەزان
ئەو ( محدثاتە ) خاوەن ( رسالة )
فەرمووی ( بدعة )ە و ( بدعة ) ضەلالە
کارێکی وایە خارج بێ لە دین
یانێ ( نصوص )ی قورئانی ( مبین )
هەروا ( نصوص )ی حەدیثی شەریف
کەئەبێ بەجێ لەباتی تەکلیف
مەنطووق‌و مەفهووم لە ڕووی ( عبارة )
ئەمجا ( اقتضا )و ئیماو ( اشارة )
اقتضاء النص ، دلالة النص
ئەمجارە بەشی اشارة النص

ترسی مەلوولیم نەبوا لێتەوە
میثالم لە بۆ ئەهانینەوە
هەروا خارج بێ لە جێگەی ( اجماع )
یانێ ( اتفاق ) بێ شوبهەو نیزاع
خارج لە قیاس لەگەڵ ( استدلال )
بۆ ( مجتهد )ی بە عیلمو کەمال
( مجتهد ) لەلای ڕەهبەری پڕنوور
( مصیب )و ( مخطیء ) مەئجوورن مەئجوور
لای مەردی زانا ( مجتهد ) بەرزە
چرای ڕووناکی تەختی سەر عەرزە
( خواص )و ( عوام ) ڕێزیان لێ ئەگرن
فەرمانی ئەوان بە دڵ وەرئەگرن
ئەگەر ( مجتهد ) نەبێ لە کارا
کاکە پێم بڵێ چیت وا لەبارا
موجتەهیدەکان لە لای زانیاران
ڕەحمەتیان هێنا بۆ رۆزگاران
ئەگەر بەمجۆرە نەگەی بە ( عرفان )
زۆر ماتڵ ئەبی لە ( نص )ی قورئان
جەمعی ئایاتو ( نصوص )ی حەدیث
کەوتە پاش فەوتی حەزرەتی ڕەئیس
گەلێ موشکیلەی چەرخی خولەفا
بە ( اجتهاد ) بوو لای خاوەن صەفا

تەدۆینی نەحوو صەرفی موبارەك
لە چەرخی عەلی کەوتە تەدارەك
( اجتهاد ) کاری خاوەن کەماڵە
کەی جێگەی تانەی وردە مناڵە
عەلاوەی ئەمە دەلیلێکی حەق
قول الرّسول الاعلی الموفّق :
اقرؤا ( یس ) علی موتاکم
نص" معلوم" وقد أتاکم
جائەگەر ( موتی ) بە حەقیقەتە
قورئان بۆ مردوو خێرو ڕەحمەتە
ئەگەر مەجازە و ئەوە مەقصودە
بۆ زیندووی موشریف قورئان بەسوودە
مادام بۆ زیندوو قورئان بەسوودە
بۆ مردووی داماو زیاتر مەقصوودە

ئەم یاساو شێوەیە کە ئیستا هەیە واتە لە شوێنێکدا لە تەعزییەخانەدا دائەنیشن و قورئانخوێن قورئان ئەخوێنێ و یەکەیەکەو کۆمەڵ کۆمەڵ خەڵك دێن بۆ پرسەو فاتیحە ئەخوێنن و پاش ماوەیەك دووبارە فاتیحە ئەخوێنن و ئەڕۆن ، ئەم شێوەیە هەرچەند زوو نەبوە بەڵام شێوەیەکی مناسب و حەڵاڵەو خاوەن سوودە لە بابەتی دینەوە •

یەکەم بە هۆی قورئان خوێندنەکەوە خەڵکی بێ دەنگ ئەبن و لە واتەی پڕوپووچ دور ئەکەونەوە • دووهەم هەموویان خێری گوێ گرتنیان لەو قورئانە دەست ئەکەوێ • سێهەم ئەوکەسانە کە لە مەعنای

.ورئاەکە حاڵی ئەبن هەندێ دەرزی ئامۆژگاری وەرئەگرن •

چوارەم ئەو قورئان خوێنە مادام نی‌یەتی ئەوەی ببێ کە مردووەکە ـە ئەوابا شەریك بێو لەئەنجاما دوعای بۆ بکا ، ئەوە ئەو مردووە بـەو ئ‌وابە ئەگا • لـە مەزهەبی شافیعی‌دا زانای وەکو ( ابن حجر )و ، لـە مەزهەبی حەنەفیدا زانای وەکو ( ابن العابدین )و ، ئیمامی ئەحمەد خۆی ئەفەرموون ئەوابی قورئان خوێنـدن وەکو بۆ قورئان خوێنەکە هـەیە ، ئەگات بەوکەسەیش قورئانەکەی بۆ ئەخوینرێ • لەم جۆرە باسانە ئەگەر ..سێ ( مخالف ) بێ ئەوە ئیعتیبار بە قسەکەی ناکرێ ؟ چونکە دەلیلی ( مقابل ) بەهێزترە • ئەم جۆرە ئەوابە بە فەضڵو ڕەحمەتی خودا ئەگا بە موسوڵمانان • زیاد لەمانە ئەوکەسە قورئانەکە ئەخوێنێ خۆی بە (نص)ی فەرموودەی حەزرەت (ص) لەسەر هەموو وشەیەک (١٠) دە حەسەناتی پێ ئەگا ئەمە لای موسوڵمانان دیارەو جێگەی ئینکار نی‌یەو ، کابرای قورئان خوێن کە ئەوابەکەی ڕەوانەکرد بۆ مردووەکەو ، دوعای کردو وتی : خوایە وێنەی خێری ئەم خوێندنی منە ڕەوانە بکە بۆ فلانە کەس ئـەوە بە بێ شوبهە ئەو خێرەی پێ ئەگا • چونـکە لـە قورئـاندا خـــوا دوعـاکـردنی پێغـەمبـەرەکان بۆ موسوڵمانان بەیـان ئەکا • وە تاریفی ئەوانەیشی کردووە کەدوعا ئەکەن بۆ موسوڵمانانی ڕابووردووی خۆیان• خوایش فەرمویەتی : ( أدعوني أستجب ) ئیتر ئەوکەسە کە ڕێگە لـەم خێرە ئەگرێ ، ئەوە ڕێگەی ڕەحمەت لـە خۆی ئەگرێ ، چونکە لەسەر ئەو بیروباوەڕی خۆیە خۆی بێبەش ئەبێ لەو خێرو ئەوابە •

زیاد لەمە حەزرەت (ص) فەرموویەتی ( سوورەتی یاسین بخوێنن بەسەر مردووەکانتانا ) ئەگەر مەبەس لە مردوو ئەوانە بێ کە مردوون ، ئەوا دەرکەوت بەم فەرموودەیە کـەخوێندنی یاسین قازانجی هـەیە بۆ مردووەکان • ئەگار مەبەسیش لە مردوو ئەو کەسانەن کەوا لەگیانەلادان

نزیکه بمرن ، ئەوا دەرکەوت کەیاسین قازانجی هەیە بۆ زیندوو ، خوای بــە قازانجی ئاسانی گیان دەرچوون بێ یا خێر بێ ، ••• وە مادام یاسین بۆ زیندوو باش بێ بۆ مردوو بە ( طریق الاولی ) باشترە ، چونکە زۆرتر موحتاجو شیاوی ڕەحمی خودایەو باقی قورئان وەکو یاسین وەها خاوەن ئەوابە ، ئیتر مەنعی قورئان خوێندن لەو مەجلیسانە بێ جێگەیەو ، خوێندنی بــە سوودە • ( ئاگاداربن ) • ئەو کەسانە کە ئەڵێن ئەم کارانە بیدعەتەو بیدعەت گومڕاهی‌یە ، ئەوە خۆیان گومڕان چونکە نازانن ئەو بیدعەتــە گومڕاهی‌یە کە ( خارج ) بێ لە مەعنای قورئانو حەدیثو گرۆی ئوممەتی ئیسلامو بیروڕای زانــا موجتەهیدەکان ، ئەگەرنا هەرشتێ لەپاش زەمانی حەزرەت بووبێ ئێمە بڵێین بیدعەتە ، ئەوە گیرۆدەی زیان ئەبین • ئینسانی موسوڵمان واجبە بگەڕێتەوە بۆسەر حەقو ، پرسیار بکا لەوکەســانە کــە شەرعیان خوێندوەو عالمی گەورەن ، هەتــا لــە ئوسووڵی دنیــا سەر لێ تێك نەچێ •

ئەمە کورتە باسێك بوو لەمشوێنەدا عەرزمکردن بۆئەوەی هوشیار بن لــە ڕێگەی ئیسلام دوورنەکەونەوە •

## زیارەتی قەبر ••• چوونە سەر قەبران

چوونە سەر قەبران سوننەتی دینە
ئەمری ڕەهبەری ڕێگەی ئاینە
گەلێ جار ئەچوو حەزرەتی شەفیع
لەبۆ زیارەتی « جنة البقیع »
ئادابی وایە چوویتە زیارەت
ڕاوەستە بەشەرم بە بێ‌جەسارەت

ژن دەرنەکەوێ ڕەنگ‌و ڕوخساری
پیاویش دەس‌نەکا بە ناهەمواری
لەسەر قەبرانا بە دڵێکی پاك
ڕاوەستن بەرەو قیبلەی شەرەفناك
یانێ ڕووبکەن لە قەبرو قیبلە
پشتی تێمەکەن وەك پیاوی سوفلە
بڵێن . سەلامی خوای پەروەردگار
لەسەر ئێوە بێت ئەی ئەهلی مەزار
ئێوە سابیق‌و ئێمە لاحیقین
بۆ ڕەحمی خودا گشت موستەحەققین
ئەمجا بەگوێرەی زەمان‌و مەکان
دەوری کەنەوە ئایاتی قورئان
لەسەر نی‌یەتی وصوولی ثەواب
بۆ ڕۆحی هەموان بێ حەددو حیساب
ئیحسانی ئەوە بەگوێرەی ئاثار
ئەگا بە هەموان لەسەر ئیعتیبار
هەروا سوننەتە زیارەتی پیاوان
بە شەرتی ئەدەب ئەبێ بۆ ژنان
بەڵام با ژنان لەگەڵ مەحرەم بن
یا لەگەڵ ژنی بێ‌قرەو دەم بن
ژن ئەگەر سەرپۆش بدەن بەسەردا
ئەگەڕێنەوە لەگەڵ ثەمەردا

زیارەتی گۆڕی باوكو دایكی خۆت
شەرعی پێغەمبەر ڕێگەی داوە بۆت
زیارەتی خوشكو براو برادەر
ڕەوایە لەسەر سوننەتی ڕەهبەر
حەزرەت ئەڕۆیشت بە دڵو بە گیان
لەبۆ زیارەتی هاوشیری عوسمان
كاتی عوسمانیان داپۆشی بە خاك
حازر بوو لەوێ سەرداری دڵپاك
تەشریفی ڕۆیشت بەردێكی دانا
لەسەر قەبرەكەی عوسمانی دانا
فەرمووی ئەم بەردە نیشانە لەبۆم
تا لێم ون نەبێ قەبری برای خۆم
برای شیری بوو ، شیرە برا بوو
بۆ دڵی حەزرەت وێنەی چرا بوو
هەروا زیارەتی مامۆستایانت
زیارەتی وەلی نیعمەی زەمانت
زیارەتی قەبری مورشیدی سەربەرز
چرای ( ثریا ) بۆ ئەهلی سەرئەرز
هەروا زیارەتی باقی ئەولیا
دەلیلی ڕەحمەت بۆ ئەهلی دونیا
ئەمجا زیارەتی موجتەهیدەكان
ئەمجا صەحابی یا شەهیدەكان
جا زیارەتی قەبری ئەنبیا
لە هەر مەكانو شوێنێكی دونیا

ئەمجا زیارەتی حەزرەتی ڕەسوول
ڕەهبەری عالەم وەسیلەی وصوول
خۆزگە ڕێ ئەکەوت لە هەموو سالێ
لەهەموو وەزعێ و بە هەموو حالێ
زیارەتی ڕەوضەی بەرزی پێغەمبەر
بە صەفای دەروونی ئەنوەر
ئەوەندە نوورت ئەهێنایەوە
دڵت بە ئەنوار ئەحەسایەوە
بە سەفەر بڕۆی چەن ڕۆژە ڕێگە
هەتا بگەیتە خاکی ئەو جێگە
ئەو خاکە بۆ تۆ وەك کیمیایە
چون خاکی بەرپێی شای ئەنبیایە
ئەمانە هەموو بۆ ئێمە خەیرن
باعیثی صەفای سلوكو سەیرن
من عەرزت ئەکەم ئەی برای عەزیز
ئەی خاوەن عەقڵو شوعوورو تەمیز
کە ( لا تشد الرّحال ) بۆ دڵ
نەکەی بە دڕك لەسەر پەڕەی گوڵ
ئەو فەرموودەیە بۆ نوێژەکانە
لەبۆ هاوشانی مزگەوتەکانە
( شد الرحال )ی ڕەوا نەداوە
بۆغەیری سێ جێ لەڕووی دونیاوە
مەککەو مەدینەو ( مسجد الاقصی )
مەوریدی ئەنوار ئیستاکەو ئەوسا

له ( فتح الباري ) تەفصیلی ئەمە
بخوێنەرەوە گەلێ موهیممە
ئەگەر نا ( شد الرحال ) پێویستە
بۆ گەلی مەقام بۆ دین مەبەستە
چون ( شد الرحال ) بۆ عیلمو عیرفان
یاخود بۆ جیهاد لەگەل کافران
یا بۆ تەداوی یا صیلەی ئەرحام
یا بۆ تیجارەت بە گوێرەی ئەییام
یا بو موهیممات لە ڕۆزگارا
بۆ دین پێویستە لە ئیعتیبارا
( شد الرحال )یش حەڵاڵە بۆ تۆ
یا فەرزە کاکە بزانە بۆ خۆ
ئیتر حەدیثێ بۆ مەوضوعێ هات
بوچی لای ئەدەی بە شێوەی نەهات
ڕەوضەی ئەنبیای کیرامی ڕەهبەر
بارانی نووریان ئەبارێتە سەر
بەتایبەت ڕەوضەی ڕەسوولی ئەکرەم
موحەممەد ( ختم المرسلین ) بە جەم
ڕۆحیان تێراوە بە نووری ڕەحمەت
پڕە لە فەیزی خەیرو بەرەکەت
ڕەوضەی ئەصحابو شوهەدای جیهاد
مەوریدی فەیزە لای ( رب العباد )
هەروەها ڕەوضەی ئەهلی ئیجتهاد
ئەمجار عولەمای تەربیەی عیباد

ڕەوضەی ئەولیای کیباری عالەم
پڕە لە ئەنوار یەقین موسەللەم
هەرکەس ئەوانە زیارەت بکا
بۆ قازانجی نوور تیجارەت ئەکا
ئەوەی دەماخی پڕ نەبێ لە زاخ
بە حەق بۆن ئەکا وەنەوشەو گوڵباخ
قەت بە بێ بەهرە ناگەڕێتەوە
بەفەیضی ئەنوار ئەحەسێتەوە
بەتایبەت یەکێ لە ئەهلی دڵ بێ
یاسای جەڵبی نوور بۆ ئەو حاصڵ بێ
چون قوتووی عەطری بۆ ئەکرێتەوە
بە نەشئەی ئەنوار ئەگەشێتەوە

## تکاو نزا چۆن ئەبێ

بەڵام لەم شوێنە بە دڵ هوشیار بە
لە شەرعی ئیسلام باش خەبەردار بە
خودا خالیقە لە هەموو کارا
پەروەردگارە لە ڕۆزگارا
دڵخوازت چی بێ لای نەبیو وەلی
لە خوای بخوازە صەریحو جەلی
بەڵێ ڕەوایە بە دڵ بێتە دەم
بڵێی ئەی خودای سەراسەر عالەم
لەبەر حورمەتی ئەم زاتە پاکە
لامدە لەو شەڕە کە خەتەرناکە

یا ئەو نیعمەتە کەرەم بکە پێم
دەرگای ئەو خێرە بکەرەوە لێم
ئەمە پێی ئەڵێن بەهرەی تەوەسسول
بە پایەو جاهی ئەنبیاو روسول
هەروا بە پایەو جاهی ئەولیا
یاخود بە جاهی گەلی ئەتقیا
هەروا بە پایەی کردەوەی چاکت
کارێ کرابێ بە لەشی پاکت
( أصحاب الرقیم )[1] وان لە ئەلکەهفا
حدیثەکەیان ( حسبی وکفی )
ئەمە بارێکە واریدە بە دین
لەسەر فەرموودەی خیر المرسلین
هەروا ڕەوایە برای خاتر جەم
بڵێیت یا ڕەسول ڕەهبەری عالەم
یاخود ئەی وەلی ئەی مەردی ئەکرەم
ئەی خاوەن تەقوا بێ زیادو کەم
دوعام بۆ بکەن بە بەرزی هیممەت
بۆ دەفعی زەحمەت یا جەلبی ڕەحمەت
ڕزگارم بکا لەو دوژمنانە
یا لەو میحنەتی ئاخر زەمانە
ئایەی ( أم حسب )[1] سورەی ( جاثیە )
لەبۆ ئیقناعی زانا کافییە

---

(١) أم حسب الذين اجترحوا السيئات أن نجعلهم كالذين آمنوا وعملوا الصالحات ، سواء محياهم ومماتهم . ساء ما يحكمون . سورة الجاثية ، الآية ٢١ .

بۆ دوعاو نزا مایەی تەوجیهن
نەبی یا وەلی لە ئەرزو فەلەك
نابێ کەمتر بن لە کەلی مەلەك
برۆ بۆ ( لە معقبات )(۱)
ئەمان زیاتر بەکەرامەتن
دوعای وەجیهان گەلێ بەجێیە
ئینکاری ئەمە واتەی بێجێیە
مەدون بە بێ دڵ مەڕۆن بە بێچاو
ئیسانی بێ چاو وا لەگوێی کەناو
چاوی سەر نەبوو ئەکەویتە چاڵ
چاوی دڵ نەبوو ئەمری بە بێ حاڵ
نەکەی ئەم شوبهە ڕووی دڵت بگرێ
چۆن داوای دوعا لە مردوو ئەکرێ
لە زیندوو داوای دوعایە بکەی
لە ڕوحی ئەیکەی نەك لە لەشەکەی
ڕۆحیش ئەمێنێ لەدوای مردن
تۆیش ئەڕۆیتە لای بۆ دوعا کردن
طەلەبی دوعایش سوننەتی دینە
ئەیکا ئەوکەسەی خاوەن یەقینە
باری تر هەیە با بڵێم پێتان
تا ئەم مەوزووعە دەرکەوێ لێتان

---

(۱) له معقبات من بين يديه ومن خلفه يحفظونه من امر الله • سورة الرعد ، الآية ۱۳ •

ئەنبیاو ڕوسول هەمو وەجیهن
کاتێ موشکیلێ بێتە بەرچاوێ
بڕۆ بۆلایان قسەی پێ ناوێ
تۆ وای لە هیوای حەللی موشکیلت
خودایش ئاگایە لە دەردی دڵت
چوویتە بارەگای ئەولیای خودا
کارت بۆ ئەکا خودا بە خودا
چونکە ئەزانێ تۆ پەنا بەری
دەرگای دۆس ئەگری کە بە ڕەبەری
لای کوورەی ئاگر گەرم ئەبیتەوە
گەرما زۆری سەند پێی ئەتوێیتەوە
لەناو بەفرەدا سەرما دات ئەگرێ
لە دەکەس نۆیان ئەڵێن وا ئەمرێ
موقتەضای حاڵە بۆ بەفرو ئاگر
سەردیو گەرمی یان (باطن) و (ظاهر)
ناڵێی بە بەفر لەرزم لێ بێنە
یا ئاگر فەرموو بێ بمسووتێنە
ئەولیا وێنەی دەرمانی دەردن
ئەمە ئەزانن ئەوانەی مەردن
ڕۆحی ئەولیا ڕۆژی ڕووناکە
مایەی ڕووناکی دەروونی پاکە
هەر باوەڕێکت بە خودا ببێ
مەقصوودت لەبۆ جێ بەجێ ئەبێ
ئەو کەسەی کە تۆ موشەوەش ئەکا
بە غەشی دڵی دڵت ڕەش ئەکا

خودا خالقە بۆ جوزئیو کوللی
سەبەبیشی بۆ کار مەکشووفەو جەلی
( وآتیناه من کل شیء
سببا ) نور بدون فیيء
کەی مەنعی دەرمان کرا لە نەخۆش
کێ لە خودای خۆی ئەبێ فەرامۆش
صالحان بەندەن بەندەی دلزیندوو
ناسالح خەستەن بەوێنەی مردوو
ئەم حەقایقە وەربگرن بە دل
بە دل ڕووناکی ئەگەن بە مەنزل
ئەگەر تۆ بلێی ئەم جۆرە کارە
دەلیلی نی‌یە لەم ڕۆزگارە
من ئەلێم هەرچی نەهیی تیا نەبێ
موباحە ئەگەر بۆ تۆ بێتەجێ
قورئان هاتەخوار لە بۆ ( استنباط )
بۆ کاری عالەم لە سەر ( انضباط )
گەر « اجتهادو استدلال » نەبێ
بەس ئەم قورئانە بۆ جوهال ئەبێ
دەم قەپان نی‌یە ئەحکامی ئیسلام
دەلیل پێوبستە لە بۆ خاصو عام
بابیبرینەوە کلافەی کەلام
ئەنجامی بێنین بە عەرزی سەلام
سەلام بۆ ڕوحی پاکی پێغەمبەر
یانێ ( محمد ) سەرداری بەشەر

بۆ ئەهلی بەیتی بۆ ئاڵو ئەصحاب
بۆ پەیڕەوانی تا ڕۆژی حیساب
( نامی ) یەکێکە ئا لەو کەسانە
بۆ شەمعی ڕووی ئەو بوو بەپەروانە
ئەگەر بسووتێ بە شەمعی ڕوخسار
یەقین ناسووتێ بە شەرارەی نار
لەسەر ( صراطا ) باڵ ئەگرێتەوە
هەتا لەسەر حەوز ئەنیشێتەوە
جامێ ئاو دێنێ لە ( حوض المورود )
زوو ئەیخواتەوە و ئەگا بە مەقصوود
لە پاش سەیرانی لە پانایی دەشت
بە شادی ئەڕوا بۆ باغی بەهەشت

## زیارەتی قــەبر

لــە سەرەتای ئیسلامیەتدا حەزرەت (ص) مەنعی موسوڵمانانی کرد لــە زیارەتی قەبری مردووان ، بەڵام پاش ماوەیەک فەرمووی : ( کنت قــد نهیتکم عــن زیارة القبــور ألا فزوروها فانها تذکر الآخرة ) یانــێ لەمەوپێش مەنعی ئێوەم کردبوو لە چوونە سەر قەبران ، بەڵام ئیستە ئەو مەنعەم هەڵگرت ، بڕۆن زیارەتی قەبرەکان بکەن چونکە ئەو زیارەتــە قیامەتتان ئەخاتەوە بیر •

چوونە سەرقەبران چەندجۆری هەیە ، یەکەم هەربۆ بیر کردنەوەیە لــە پاشەڕۆژ ، ئەمە بەتێکــڕا بۆ هــەموو موســوڵمانان ئەبێ لە ناســراوو نەناسراو • دووهەم بۆ صیلەیڕەحمە ، ئەمە تایبەتی یە بۆ باوک‌و دایک‌و

خزم‌و که‌س‌و کار • له حه‌دیثا هه‌یه ، هه‌رکه‌س هه‌موو جومعـه‌یه‌ک زیاره‌تی باوک‌و دایکی بکا ، ئه‌وه وه‌کو حه‌جێکی کردبێ وایه ، سێهه‌م بۆ به‌جێ هێنانی حه‌قی صه‌داقه‌ت‌و دۆستی‌یه ، ئه‌مه‌ش بریتی‌یه له زیاره‌تی دۆسـتان‌و براده‌ران بۆ ئـه‌دای حـه‌ق‌و حوقووق ، چونکه دوعـای خه‌یریان بۆ ئه‌کا ، وه‌یا فاتیحه‌یان بۆ ئه‌خوێنێ • چواره‌م : بۆ وه‌رگرتنی به‌ره‌که‌ت‌و پیرۆزی‌یه ، ئه‌مه‌یش چه‌ند نه‌وعه : یه‌که‌م وه‌کـو زیاره‌تی ئارامگای حه‌زره‌تی پێغه‌مبه‌ر سه‌لامی خوای لـێ بێ کـه فـه‌رموویه‌تی : هه‌رکه‌س زیاره‌تی من بکا ئه‌وه شـه‌فاعه‌تی بۆ ئه‌که‌م ، هـه‌روا زیاره‌تی ئارامگای باقی پێغه‌مبه‌ره‌کان سه‌لامی خوایان له‌سه‌ر بێ یا خود زیاره‌تی ئارامگای دۆستانی خواو پیاوچاکان وه‌کو شاهی نه‌قشبه‌ند یـا غه‌وثـی گه‌یلانی یا باقی ئه‌ولیاکان خودایان لێ ڕازی بێ •

جا ئوسوولێ زیاره‌تی ئه‌وانه وایه یه‌که‌م جار ده‌ستنوێژ بگرێ • کاتێ ڕۆیشته ئه‌و ئارامگایه بڵێت ( ألسَّلام عليكم دار قوم مؤمنين وانا ان شاء الله بكم لاحقون ) •

پاش ئه‌و سه‌لامه له لای قه‌بری فه‌خری عالەما له خوا بپاڕێته‌وه که پایه‌و مه‌قامی ئه‌وذاته به‌رز بکاته‌وه جا بپاڕێتـه‌وه بۆ ده‌فعی موصیبه‌ت له خۆی • یا بۆ جه‌لبی ڕه‌حمه‌ت‌و ئه‌نجامی خێر بۆ خۆی ، چونکـه ئارامگای ئـه‌م جۆره که‌سانه ، جێگه‌ی به‌ره‌کـه‌ت‌و پیرۆزی‌یـه ، وه‌کـو چۆن یه‌کێ ڕابووری بـه باغچه‌یه‌کدا بۆنی گوڵ ئـه‌دا له ده‌ماخی ، وه‌هـا له‌مه‌قامی ئه‌وانه‌یشدا ، ڕه‌حمه‌تی خوا ئه‌گات به دڵی • وه ئه‌گه‌ر هه‌رچه‌ند له ئایاتی قورئان بخوێنێ به نیازی ئـه‌وه کـه ئه‌وابه‌کـه‌ی بگات بـه‌و زاتانه‌و ، له‌ئه‌نجامیشدا دۆعایان بۆ بکا ، ئه‌وه ئه‌وان ئیستیفاده‌ی لێ ئه‌که‌ن له‌سـه‌ر فه‌رمووده‌ی گه‌لێ له عالمه‌کان ، یانێ له حه‌قیقه‌تا ئـه‌م گه‌یشتنی ئه‌وابـه جێگه‌ی خیلافه ، به‌لام بیری به‌هێزو فیکری به‌رزی زاناکان له‌سه‌ر ئه‌وه‌یه

له : ئەو ئەوابەیان پێ ئەگات ، خاوەنی ئەم بیره ئەلێن لـەزانـا کانـی مەزهەبی شافیعیو حەنەفیو مالکیو حەنبەلی •• ئێمـه باوەڕمان هـەیەو خودایش دەرگای کەرەمی زۆر کوشادە •

ئەساسی ئەم باوەڕە ئەوەیە : کە بە کوێرەی فەرموودەی حەزرەت (ص) قورئـان خوێندن ئەوابی زۆرە وە لەسەر هەر حەرفێ دە ئـەواب هەیەو دۆعاکردن بۆ مردوو یا زیندوو سوودبەخشە بە (نص)ی ئایەت ، جـا ئێمە قورئانەکە ئەخوێنینو ( اهدا )ی میسلی ئەوابەکەی ئەکەینو دوعایشیان بۆ ئەکەین ، ئیتر چاومان لەوانەی ( مخالف ) دەوە نی یە ، کـە بە بێدەلیل بۆ خۆیان قسە ئەکەن ، بەڵام زیارەت کردنی ژنان بۆ سـەر قەبران بەو مەرجە دوروستە یا مەحرەمیان لەگەڵا بێ ، یاخود لەگەڵ دوو سێ ژنی وادا بێت کە شەرمیان لێ بکرێو خۆیان دەرنەخەن تا نامەحرەم تەماشایان بکاو ، بۆ گریانو هەڵ خۆندنیش بە مردووەکانا نـەڕۆن •

ئەمە یەکێکە لە ئادابی زیارەتی قەبران هیوام وایە ڕەفتاری پێبکەن ، ن شاء الله ئەبێ بەهۆی جـەزای خێر بۆ خۆتـانو تاوانپۆشی ، یـان بەرزکردنەوەی پایەی ئەوان لەلای خوای تەعالا ••

وصلى الله على سيدنا محمد واله وصحبه واتباعه باحسان الى يوم الدين وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين •

تەواو بوو نووسینی ئەم کتێبە پیرۆزە لەلایـەن موحتاجی ڕەحـمی خوای ( ارحم الراحمين ) عبدالكريـم محمد مودەڕیسی مـەدرەسـەی حەزرەتی شیخ عبدالقادری گەیلانییەوە لە شاری بەغدا لە ساڵی ١٤٠٥ی کۆچیو ١٩٨٤ی زاینی •

# ناواخــن

# ڕاستکردنەوە

تکایــە بەر لە خوێندنەوە ئەم دوو هەڵەیە ڕاست بکەنەوە یەکەم :

لــە لاپەڕە (٣٠)دا دێڕی (١٢) هەم زیادەیە لای بەرن و لەپاش دێــڕی (١٣) هەم ئەم دێڕە دابنێن :

« پێی ئەڵێن ( خمار ) • بەڵام بۆ پیاو هەرچەند مانیعیش نەبێ لــە زیادکردنی » •

دووهەمیش : لە لاپەڕە (٧٣) دا دێڕی یەکەم بگوێزنەوە بۆ سەرەتای لاپەڕەی (٧٢)و بیکەن بە دێڕی یەکەمی ئەو لاپەڕەبە •